

بیرەوەرییەکانی

ئەلکسەندەر ئەلکسیڤیچ میاگۆف

ئەفسەری پایەبەرز K.G.B

چاپی سێیەم

# دەزگای سیخوڕی یەکێتیی سۆڤیەت

منتدى اقرأ الثقافي
www.iqra.ahlamontada.com

عبدولرەحمان عەلی کوردە

کردوویەتی بە کوردی

# دەزگای سیخوڕی یەکێتیی سۆڤیەت

ئەلکسەندەر ئەلکسیڤیچ میاگۆف

ئەفسەری پایەبەرز

K.G.B.

وەرگێڕانی: عەبدولڕەحمان عەلی کوردە



کولتوور | بۆ چالاکیی ئەدەبیی و فەرهەنگی

زنجیرەی کتێب٢٢

# دەزگای سیخوڕی یەکێتیی سۆڤیەت

## ئەلکسەندەر ئەلکسیڤیچ میاگۆف

## ئەفسەری پایەبەرز

## K.G.B.

**وەرگێڕانی: عەبدولڕەحمان عەلی کوردە**



| نووسەر: ئەلکسەندەر ئەلکسیڤیچ میاگۆف |
|---|
| بابەت: بیرەوەریی |
| ناوەڕۆک: کولتوور |
| بەرگ: ئیبراهیم ساڵح |
| وەشانخانە: کولتوور |
| نرخ: ٤٠٠٠ هەزار دینار |
| چاپ: سێیەم ٢٠٢١ |
| چاپخانە: تاران |
| تیراژ: 1000 دانە |
| ژمارەی سپاردن: ١٨٢ ی ساڵی ١٩٩٩دراوەتێ |

# سەرەتایەک:

خوێنەری هێژا. ئەم کتێبەی بەردەست، دووەم بەرهەمی وەرگێڕدراوی منە و ئەمەیان دوابەدوای بەرهەمی یەکەمم، (کورڕێژ، کورتە ڕۆمان) هات و ماوەی ساڵێک دەبێت تەواوم کردووە و ئامادەی چاپە، بەڵام نەگونجاوە تا ئەمڕۆ بە چاپی بگەیەنم، کە دەبوایە ئەمەیان سێیەم بەرهەمی چاپکراوی من بێت لە بواری وەرگێڕاندا، بەڵام بەرهەمی دووەمم کە چیرۆکێکە بۆ منداڵان بەناوی (پیرەژن و کاریلەکەی)، لە ئینگلیزییەوە کردوومە بە کوردی و ماوەی زیاتر لە ساڵێک دەبێت ئامادەی چاپە. لە (بەڕێوەبەرایەتی گشتیی ڕۆشنبیری و هونەر) ی وەزارەتی ڕۆشنبیری لە نۆبەی چاپدایە. بەو ئومێدەی نۆبەتێکی بەرکەوێت بۆ لە چاپدانی. کاری چوارەمیشم بە نیوەچڵی واز لێهێنا، چونکە بابەتەکەم بەدڵ نەبوو. کاری پێنجەمیشم دەست پێکردووە، کە بریتییە لە کتێبی (کردها و کردستان)، لە نووسینی (دێرک کینان) کە وەرگێڕانی بۆ فارسی لەلایەن نووسەر و وەرگێڕی دیار (ئیبراهیم یونسی) یەوە. گەر خوای گەورە پشتیوان بێت بە کۆتایی و بە چاپی دەگەیەنم.

خوێنەرانی ئازیز، دیارە کاری سەرەکی من پرۆسەی وەرگێڕان نییە، بەڵام ئەوەی پاڵی بە منەوە نا چەند هۆیەک بوون، کە ئەم چەند بەرهەمە وەرگێڕدراوەم، پێشکەش بە ئێوەی بەڕێز بکەم، ئەویش ئەم چەند خاڵە دەگرێتەوە:-

بێکاری و بۆ پڕکردنەوەی ئەم کاتە زۆرەی من هەمبوو، بەکارێکی باش.

- ئەوەی زیاتر هاندەر بوو بۆ من، کتێبخانە دەوڵەمەندەکانی ئێران بوو، کە زۆر سەرنجی منی ڕاکێشا .

کەم کتێب هەیە لە جیهاندا، چاپ کرابێت و بە زمانی فارسی، وەرنەگێڕدرابێت .

- بۆ خزمەتکردن بە کتێب خوێنەرانی میللەتەکەم و بەشداربوون لە دەوڵەمەندکردنی کتێبخانەی کوردی.

دەکرێ بڵێم: بە پێی ئەوەی لە چەند قۆناغێکی خوێندندا، لە ئێران و بە فارسی دەرسم خوێندووە زۆر لە ئێران ژیاوم و بۆ ماوەیەکی زۆر پەیوەندی ڕاستەوخۆم، بەم زمانەوە هەبووە، شارەزاییەکی بچووکم لەسەری هەیە و توانایەکی بچووک لە خۆمدا شک دەبەم لە بواری وەرگێڕاندا کاری پێ بکەم. بۆیە توانای خۆم تاقی کردەوە.

- ئەمە بۆ زیاتر بەهێزکردنی زانیارییم لەسەر زانین و فێربوونی زمانی فارسی و شارەزابوونی زیاتر لەسەری و لە بیرکردنەوەی ئەوەی دەیزانم، هۆکارێکی تر بوو.

- لەلایەکی ترەوە، ئەرکی هەموو قەڵەم بەدەستێکە، لەهەر بوارێکدا توانایەک لە خۆیدا شک ببات، لە خزمەت کردن بە زمانەکەی و خوێندەوارانی میللەتەکەی، توانای خۆی بەکارخات.

بە کورتی ئەمانە بوون، ئەو هۆکارانەی بوونە هاندەر بۆ من بۆ کارکردن لەم بوارەدا.

کتێبی بەردەست، کە لە نووسینی ئەفسەری پایەبەرزی (K.G.B (ڕائد میاگۆف)ە، کە لە (٢ ی شوباتی ساڵی ١٩٧٤)، لە دەست ئەم دەزگایە هەڵات و بووەتە پەنابەری ڕۆژئاوا، کتێبەکەی لەلایەن (اسکندر

دلدم)، وەرگێڕی بەڕێزی ئێرانی، کراوەتە فارسی و منیش لەوەوە وەرم گێڕاوەتە سەر کوردی. وەرگێڕانەکە، لە دەقە فارسییەکەوە هاتووە و دەقاو دەق بەبێ دەستکاری ناوەڕۆکی بابەتەکان کارەکەم کردووە، تەنها ئەوە نەبێت، وام بە باش زانیوە، بۆ ماندوونەکردنی خوێنەری ئەم کتێبە و دووبارە ڕێکخستنەوەی بابەتەکان، بەبێ دەستکاری کردنی ناوەڕۆکەکان، هەندێ بابەتی درێژ، کە چەند بابەتێکی لە خۆوە گرتبوو، جیام کردۆتەوە و سەر لە نوێ ڕێکم خستۆتەوە و بۆ هەر یەکەیان، سەرە بابەت. واتە (عنوان)م بۆ داناوە. واتە ئەگەر دەستکاریش کرابێت، کە من نازانم کراوە یان نا؟ ئەوە پێشتر بووە، کە من لێرەدا ناتوانم ئەوە بڵێم، چونکە جگە لەم کتێبەی بەردەست، هیچ وێنەیەکی تری ئەم کتێبەم لەبەر دەستدا نییە.

بەپێی لێکدانەوەی خوێنەرەکە بێگومان هیچ بەرهەمێک، بەبێ کەموکوڕی و ڕەخنە نابێت و ئەوەندەی بەندە بەم بەرهەمەش ئەوپەڕی هەوڵم داوە، ئەوەندەی بۆم کرابێت و زانیاریم ڕێگای پێدابم، کەموکوڕییەکانیم کەم کردووەتەوە، بەتایبەتی لە لایەنی پیتچنین و هەڵەبڕی و ڕێکخستنی بابەتەکان و هەندێ لە کارە هونەرییەکانی، کەم خۆم ئەنجامم داوە. ئومێدیشم وایە توانیبێم خزمەتێکی بچووک، پێشکەش بە کتێب خوێنەرانی میللەتەکەم کردبێ و لە دەوڵەمەندکردنی کتێبخانەی کوردی دا، شەرەفی ئەم بەشداریەم، بەرکەوێ . دیارە بەوەش، زۆر خۆشحاڵ و گەورە دەبم، کە هەر بەڕێزێک، لە کەم و کورییەکانی ئاگادارم بکاتەوە، بۆ ئەوەی گەر خوای گەورە پشتیوانم بێت، بۆ بەرهەمە داهاتووەکەی بەردەستم کەڵک لە ڕەخنە و پێشنیارو بۆچوونی ئێوەی بەڕێز وەربگرم بە سوپاسەوە.

بەڕێز، کتێبی بەردەست، باس لە دەزگای موخابەراتی یەکێتیی سۆڤیەتی پێشوو (K.G.B) دەکات، ئەو دەزگایەی کە لەسەرتاسەری جیهان خاوەن تۆڕی سیخوڕی زۆر و هیچ شوێنەک لە جیهاندا نەبووە،

ئەم جیهازە سیخوڕییە چالاکی تێیدا نەنواندبێ و کاری تیانەکردبێ، بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان لەسەر حیسابی وڵاتان و میللەتانی خانەخوێدا. دیارە هەر دەوڵەتێک، میللەتێک، حزبێک، یان گروپ و ڕێکخراوێک، مافی خۆیەتی لە پێناو پاراستنی ئاسایشی نەتەوەیی و چاودێری کردنە سەر دوژمنەکانی و بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆی، پێویستی بە دام و دەزگایەکی تایبەت هەیە، بۆ ئەنجامدانی ئەم مەبەستەی، بەڵام دەبێ ئەم دەزگا تایبەتە چوارچێوەیەکی ڕێک و پێک و گونجاو و یاسایی هەبێت و لەم چوارچێوەیە دەرنەچێ و ڕەچاوی مافی خەڵک و مافی گەلان و وڵاتانی تر بکا و خزمەتێکی ڕاستەقینە پێشکەش بە خاک و وڵات و میللەتەکەی بکا و سەرەتاکانی مافی مرۆڤ پێشێل نەکا و لە چوارچێوەی کارە شەرعی یەکەی خۆیدا هەنگاو بنێ و دەست دە کاروباری ناوخۆی وڵاتان و میللەتانی تر وەرنەدا و هەرکارێکی ناشەرعی بۆ ئەو شەرعی و هەر کارێکی ناڕەوا بۆ ئەو ڕەوا نەبێت و نەبێ بە دیکتاتۆر و مافیا. گەر ئەم دەزگایە لەسەر ئەم ڕێبازە بڕوات بێگومان ئەوە کارەکانی یاسایی و شەرعییە، بەڵام گەر لەسەر ئەو ڕێڕەوە لایدا، ئەم مافە دەبێتە ناشەرعی و کاری ئەم دەزگایە دەبێتە سیخوڕی کردن و دەستدرێژی کردنە سەر مافی گەلان و بە دیکتاتۆر و مافیا ناو دەردەکات. بێگومان ئەگەر دەزگایەکی واش لە چوارچێوە یاسایی و شەرعی و ڕەواکەی خۆی بچێتە دەرەوە، لە پێش هەموو شتێکدا کارەکانی بە سلبی بەسەر خودی خۆیدا دەشکێتەوە ئەم پشتیوانیەی کە پێویستە لێ بکرێ نایمێنێ و دەبێتە دەزگایەکی خۆخۆر و ڕۆژێک خودی میللەتەکەی خۆی لێی ڕادەپەڕێ جا چی بگاتەمیللەتانی تر کە ئازاریان لەدەستی دیوە، (وەک کورد گوتەنی دار هۆرەی لە خۆی نەبێت ناقڵەشێ). ئەو ڕۆژەیە دەبێ باجی گرانی خراپەکارییەکانی خۆی بداتەوە و ئەو ڕۆژەیە هیچ شتێک دەفریای ناکەوێ. نموونەی زیندووش هەر لەم سەردەمەی ئێستا ئێمەی تێداین، گەلێ زۆرن، ئەوەتا ساواک و شای ئێران لە ساڵی ١٩٧٩ چیان بەسەر هات، لەدەست ڕاپەڕینی گەلانی

ئێرانی؟ ڕۆمانیای چاوسیشکۆ و دەزگا سەرکوتکەرەکانی بەرەو کوێ چوون؟ حکومەتی عێراق و دەزگا داپڵۆسێنەرەکانی و ڕاپەڕینەکەی ئاداری ساڵی ١٩٩١ ئاکامەکەی چی بوو؟ خودی یەکێتیی سۆڤیەت و دەزگا سیخوڕیەکەی لەژێر باهۆزی (پرۆسترۆیکای گورباچۆف)، چی بەسەر هات؟ ئینجا پینۆشە و سۆهارتۆ و میلۆسۆڤیچ و دەیان نموونەی تری دیکتاتۆریەت، وەک هیتلەر و مۆسۆلینی .هتد، چیان بەسەر هاتوو بەرەو کوێ چوون؟

بێگومان چارەنووسی دیکتاتۆریەت و ملهوڕی و خراپەکاری دیارە و ڕۆژێ دادێت، جەماوەری ڕاپەڕیوو و داخ لە دڵ، کوڵی دڵی خۆیان پێ دادەمرکێنن و تۆڵەی کردارە خراپەکانیان لێدەکەنەوە و بەرەو هەڵدێر و زبڵدانی مێژوو دیاننێرن. کەواتە پێویستە ئەمانە پەند و عیبرەت بن بۆمان و بیکەین بە دەرس و کەڵکی لێوەربگرین. کاری باش بکەین، خزمەتی ڕاستەقینەی بە میللەت و خاکەکەمان بگەیەنین، دوور لە دەمارگرژی و بەرژەوەندییە تایبەتیەکان، بەپێی یاسایەکی گونجاو لە چوارچێوەی بەرژەوەندی نەتەوەیی و ئاسایشی وڵاتەکەمان دەرنەچین و پارێزەری سەرەتاکانی مافی مرۆڤ بین. توندو تیژی و دیکتاتۆریەت و زەبرو زەنگ باوی نەماوە و جگە لە بەدبەختی بۆ خودی ئەنجامدەرەکەی، ئاکامێکی تری باشی بەدواوە نی یە و نابێت. پێویستە دوژمنانی ئازادی و مافی گەلانی ژێر دەستە و ستەم لێکراو، دان بەم ڕاستی یەدا بنێن و (لە کەری شەیتان دابەزن) و واز لە دیکتاتۆریەت و نادیدەگرتنی مافی ڕەوای ئەم گەلانە بهێنن و چیتر سامان و و پارەو پوڵی وڵاتەکەیان لەم دەزگا سیخوڕی و سەرکوتکەرانە و بەرنامە گلاوەکانیان، بەفیڕۆ سەرف نەکەن و ئەم چەند نموونانەی سەرەوە و وێنەی ئەمانە بکەن بە پەندو عیبرەت بۆ خۆیان و سوودی لێوەربگرن. پێویستە ئەمانە خۆیان، خۆیان بکەن بە شەکر کە جیهانی ئەمڕۆ سەردەمیەتی و خۆشیان و ئەمانیش (واتە میللەتە ژێردەست و ماف

خوراوەکان)، ئاسوودە بکەن کە مافێکی شەرعی و ڕەوای هەموو میللەتێکە. پێویستە دان بە مافە نەتەوایەتیەکانیان دابنێن، کە دوور یا نزیک، دەبێ ئەم مافە وەربگرێ و بیگاتێ و ڕۆژێک دادێ هەر دەیگاتێ چی درەنگ بێت یا زوو.

**وەرگێڕ**

**هەولێر، ئابی ١٩٩٩**

## له بابەت نووسەری کتێبەوە:

(ئەلکسەندەر ئەلکسیڤیچ میاگۆف) لە ساڵی ١٩٤٥ لە گوندێکی بچووکی رووسیای ناوەڕاست لە دایک بووە . لە سەردەمی خوێندنی دواناوەندیدا بووە بە ئەندامی یەکێتیی لاوانی کۆمۆنیست (کۆمسۆمۆل – KOMSOMOL) . لە ساڵی ١٩٦٢ دا چووەتە کۆلێژی ئەفسەرانی هەوایی لە (ڕیازان – RYAZAN) و لە پاش تەواوکردنی کۆلێژەکە چووەتە ناو سوپای سوور بۆ خزمەت کردن و پلەکانی سەربازی تا پلەی سەرگورد (ڕائد) لە شوێنی جیاجیادا گوزەراندووە . (میاگۆف)، پاش دەرچوونی لە کۆلێژی ئەفسەری لە کاتی خزمەت کردنی لە سوپای سووردا لە (K.G.B) یش کاری دەکرد. لە کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٦٧ ی زایینیدا داوای لێکراوە وەک ئەندامێکی (K.G.B) کاربکا و مەشقە سیخوڕی و دژە سیخوڕییەکانی لە (نۆڤۆسیبریسک – NOVOSIBRISK)و ناوەندەکانیتری ڕاهێنانی (مرکز التدریب) ی (K.G.B)گوزەراندووە.

(میاگۆف) ماموورییەتێکی پێنج ساڵەی لە ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات پێ سپێردراوە و لەم ماموورییەتەیدا هەڵات و بوو بە پەنابەری ڕۆژئاوا. کێشەی هەڵاتنی ئەم کاربەدەستە نهێنیەی (K.G.B) لە ئەڵمانیای ڕۆژهەڵاتەوە و پەنابەرێتی ئەو بۆ ڕۆژئاوا کە لە ٢ی شوباتی ١٩٧٤ ڕووی دا هەرایەکی گەورەی لەنێوان پەیوەندی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا دروست کرد. (میاگۆف) بەهۆی پلە و پایەی کاری خۆی ئاگاداری زۆری هەبوو لەسەر چالاکییە نهێنیەکانی دەزگای سیخوڕی (K.G.B) لەم چەرخەدا کە بەشێکی لەوانە لەم کتێبەدا ئاشکرا کردووە.

## پوختەیەک لەسەر ژیانی نووسەر، لە زمانی خۆیەوە:



من لە سالی ١٩٤٥ ی زایینی، لە گوندێکی بچووک لە ڕووسیای ناوەند لە دایک بوومە. دایک و باوک دێهاتی ئاسایی و مندالیان زۆر بوو، بە تێکڕا شەش مندالیان هەبوو کە من گەورەکەیان بووم . زۆر لە دوای لە دایکبوونی من تێنەپەڕیبوو کە مالی ئێمە بۆ شارێکی بچووکی (لیبدیان Lebedyan–)کۆچی کردبوو. مێژووی ئەم شارە بچووکە و دروست بوونەکەی، دەگەڕێتەوە بۆ چاخە دوورەکان و پێش دەست بەسەرداگرتنی تەتەرەکان بەسەر خاکی ڕووسیادا . چەقی شار دەکەوێتە سەر تەپۆلکەیەک کە زەمانی خۆی قەلایەکی بەهێز و قایم و گەورە بووە، بۆ ڕێگە گرتن لە هاتنی تەتەرەکان بۆ ناو شار .. ناوەکانی وەک شەرکەر، تیرهاوێژ، کەوانساز، سوارچاک، قەزاق و تەتەر، کە لە شەقامەکانی ئەو شارە نراوە، نیشانەی ڕابردووی نیزامی ئەم شارەیە .. دیارە لە دوای کودەتای ئۆکتۆبەر ناوی شەقامە سەرەکی و گەورەکانی شارو مەیدانەکان گۆڕدرا بۆ لینین، مارکس، کودەتا، کرێکار و وێنەی ئەمانە.

تا پێش کودەتای بەلشویکەکان، لە شاری (لیبدیان)، وەک شارەکانیتر وولات کلێسا و پەرستگای زۆر هەبوون. بەلام لە دوای کودەتا، ئەم شوێنە مەزهەبیانە کرانە کۆگا و مەخزەن و تەنانەت شوێنی ڕاگرتنی ئاژەل و مالات و هەندێ لەو شوێنانە کە فراوان و گەورە بوون کران بە نادی کۆمۆنیستەکان.

کۆمۆنیستەکان و پەیڕەوانیان ئیماندارەکانیان بە مرۆڤی دواکەوتوو و کۆنەپەرست لە قەلەم دەدا .. بەلام لەگەل ئەوەشدا کە زۆر دژایەتی و خەبات دژی مەزهەب دەکرا لەو خەلکانەی کە باوەڕیان بە

مەزهەب هەبوو لە شارەکەی ئێمەدا کەم نەبوون .. تەنانەت خودی من و هاوتەمەنەکانم، لە دایک و باوکمان بیستمان کە لە کڵێسا بە ناچاری و بە بێ ئەوەی ئارەزووومان لێی بێ (مێشکمان لە مەزهەب شۆراوەتەوە) واتە (غسل الدماغ) کراوین..

لەو قوتابخانەیەی دەرسمان لێی دەخوێند مامۆستاکانمان مە بەشێوەیەکی ئاسایی لەناو کۆمۆنیستە توندڕەوەکان هەڵدەبژێردران هەوڵیاندەدا ڕەگی مەزهەب لە ناخ و دڵی ئێمەدا لە ڕیشە هەڵکەنێن . قوتابییانیان ناچار دەکرد ببن بە ئەندامی (یەکێتیی لاوانی کۆمۆنیست)، ناسراو بە (کۆمسۆمۆل . (KOMSOMOL – ئێمەیان وا پەروەردە دەکرد کە مەزهەب خورافات و پاشماوەی چەرخی نەزانییە. دین و مەزهەب بەشێوەیەکی گشتی و هەمیشەیی دەبێ وەلابنرێن. چوونە کلێسا بە مانای لەدەستدانی زۆر ئیمتیاز بوو. ئەگەر کەسێک چووبووایە کلێسا ئەوەندە گاڵتەی پێ دەکرا و بە کەم سەیر دەکرا کە زۆر لە ژیان بێزار دەبوو. ئەگەر یەکێکیش باوەڕی بە خودا هەبووایە لەلای کەس باسی نەدەکرد، لە ترسی ئەوەی نەوەکا گاڵتەی پێ بکرێ و لەعنەتی لێبدەن. منیش لە ناو ئەم بارودۆخەدا دەژیام.

من ئەندامی (کۆمسۆمۆل) بووم و ئەگەر پەیوەندییم نەکردبا، دەرگای زانکۆکان لەسەرم دادەخران . پاش تەواوکردنی دواناوەندی دایک و باوکم ئارەزوویان لێ بوو بچمە زانکۆ، بەڵام من ئارەزووم بوو بچمە، کۆلێژی نیزامی (ئەفسەری)، مۆسکۆ. کاری نیزامی پیشەیی ئارەزووی من بوو و لەم تەمەنە لاوێتی یەدا، لەبەرکردنی جل و بەرگی نیزامی، لەلای من نیشانەی ئازایەتی و پیاوەتی و مەردایەتی بوو و ئاوێنەی ژیانێکی پڕ لە مەترسی و ڕووداوی بەخۆوە دەگرت.

بۆ گەیشتن بەم مەبەستە لە ساڵی ١٩٦٢ دا پاش سەرکەوتنم لە ئەزموونەکانی بوونە قوتابی، کۆلێژی ئەفسەری (ریازان –

(RYAZANکە تایبەت بوو بە پەروەردەکردنی ئەفسەرانی هێزی هەوایی . ماوەی خوێندنی ئەم کۆلێژە چوار ساڵی تەواو بوو کە قوتابی پاش دەرچوونی لە دەورەکە بە پلەی (مولازم) دەرچووە خزمەتی سوپا.

مەشقەکان زۆر چڕو پڕ و هەمەلایەنە و گران بوون. لەهەموو ماوەی عەشق و خوێندن دا، بێجگە لە پسپۆری لە کاری نیزامی، وانەی زمانە بیانییەکان، فیزیا، کیمیا و وانەی تری زانستیمان وەردەگرت. بێجگە لەمانەش، مەشقە تایبەتییە پێویستەکانی خراپەکاری و چالاکییەکانی بەدەست هێنانی دەنگ و باس و سیخوڕی کردنیش فێر دەکراین . فێرکردنی زمانە بیانییەکان زۆر فراوان بوون و هەر بیست قوتابی، زمانێکی تایبەتی فێردەکران .. تەنانەت زمان و لەهجەی ناوچە دوورەکانیش، لەم کۆلێژەدا دەووترانەوە، کە ئێمە تا ئەو ڕۆژە نە ناوی وڵاتەکە و نە ئەو ناوچەیەمان نەبیستبوو کە بەم زمانە گفتوگۆ دەکەن.

بە زۆری و بەفشار خستنە سەر و بە توندی، دەیانچەساندە میشکمان، کە وەفادار بین بە سیستەمی فیکری فەرمانڕەوا لەسەر یەکێتیی سۆڤیەت. هەوڵیان دەدا فێرمان بکەن و وا پەروەردەمان بکەن، بۆ پارێزگاری لە سۆشیالیزم، گیانی خۆمان فیدا بکەین. ئەم جۆرە دروشمانەش، لەسەر دەرگا و دیواری قوتابخانەکان و پۆلەکانی کۆلێژی ئەفسەری نووسرابوون و تەنانەت لەسەر کتێبەکان و ئەو کاغەزانەی بە ئێمەشیان دەدا و لەسەر کارتی پێناسەی کەسایەتی و هەر شتێک کە لە پێش چاوی ئێمەدا بووایە، ئەم جۆرە دروشمانەی بەخۆوە دەگرت. فێرکەرانی ئێمە هەوڵیان دەدا، بەشێوەیەک بڕوای ئێمە بە (خۆ کوشتن لە پێناو پارێزگاری لە سۆشیالیزم) بەهێز بکەن کە بۆ ئەنجامدانی هەر کارێک ئامادەبین و لە کاتی پێویست وەک (کامیکازە – Kamikaze) یابانییەکان خۆ بکوژین. ئێمەیان بۆ ئەنجامدانی هەر کارێک پەروەردە دەکرد. مەشقی وایان پێ دەکردین کە لە هێڵی پشتەوەی دوژمن بە

بڕوایەکی بەهێز و بێ بەزەیانەوە دەست بەکاربین و بەبێ دواکەوتن دەست بکەین بە تیرۆر و خەرابکاری و مرۆڤ کوشتن.

## پێشەکی:

لەبارەی بابەتی کتێبەکە، دەزگای سیخوڕی یەکێتیی سۆفیەت و دەزگا سیخوڕی زانیارییەکانی جیهان تا ئێستاشی لەگەڵدا بێت سەدان وتار و کتێبی لەبارەوە نووسراوە. لەمانەش وەک (C.I.A) ئەمریکی و (K.G.B)ڕووسی و (موساد) ی ئیسرائیلی و هی تر، کە سەرجەمی چالاکییەکانیان پەیوەندی هەیە بە فراوانی بەرژەوەندی دەوڵەتەکەیان لە سەرتاسەری جیهاندا و ئەمڕۆ تەنیا لەناو چوارچێوەی وڵاتی خۆیاندا کارناکەن. شێوەی بەدەست هێنانی زانیاری و چالاکی یە سیخوڕیەکان بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر پەرەی سەندەوە. ئاڵۆزترین تەکنەلۆجیای دەستکردی مرۆڤ لە قوڵایی ئۆقیانووسەکانی جیهان یا ئەو کەسانەی مەبەستیان بێت دەخرێنە ژێر چاودێری ووردەوە . لە مەداری زەوییەوە (کەشتی یە سیخوڕییەکان)، بە ماهوارە (قمر صناعی)، وێنەی سەنەدو بەڵگەنامە نهێنییە شاردراوەکان لەناو سندوقی ئاسنی گەورە و داخراودا دەگرن. دەزگاکانی گواستنەوەو گەیاندنی گفتوگۆی وەک تلیکس، تەلەگراف، تەلەفۆن و هێڵەکانی مایکرۆف دەخەنە ژێر چاودێری سیخوڕییەوە . لەگەڵ ئەوەشدا ئەم دەزگایانە وازیان لە شێوازە کلاسیکییەکان نەهێناوە، چالاکی یە سیخوڕییەکان و بەدەستهێنانی زانیاری بۆ مەبەستە تایبەتییەکانیان بە ڕێگا ناسراوەکان هەروا بەردەوامە.

(ڕائد میاگۆف) ئەفسەری پێشوو (K.G.B) کە بووەتە پەنابەری ئەڵمانیای ڕۆژئاوا و پاشان چووەتە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، لەگەڵ بڵاوکردنەوەی بیرەوەرییەکانی خۆی لەسەر ساڵەکانی خزمەتی لەم دەزگا تۆقێنەرە ئاسایشی و سیخوڕی یەدا کەوتە سەر باسکردنی ئۆرگانی (کۆمیتەی ئاسایشی نەتەوەیی) و ئۆرگانەکانی تری

پێکهێنەری و چۆنیەی بەڕێوەبەرایەتی کردن، بەرنامەکان، لێپرسراویەتی یەکانی و سیفاتی تری. (K.G.B)

(میاگۆف) دەڵێ :- دەوری (K.G.B) فراوانە و تەنها سیخوڕی نیە و بەڵکو کۆنترۆڵ کردنی هەموو ڕووداوەکان لەناو خاکی فراوانی یەکێتیی سۆڤیەت و وولاتانی ئەورووپای ڕۆژهەلات کە سەر بە (مۆسکۆ ن، لە هەموو شوێنە جیاجیاکانی جیهان کە سۆڤیەت لەو وولاتانەدا بەرژەوەندی هەبێت بە ئەستۆوە دەگرێ . ڕاددەی فراوانی چالاکییەکانی (K.G.B)لەهەر ولاتێکدا بەندە بە فراوانی بەرژەوەندییەکانی سۆڤیەت لەو ولاتەدا.

# پوختەیەک لەسەر مێژووی دامەزراندنی(K.G.B)

مێژووی دامەزراندنی ئەم دەزگایە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵەکانی سەرەتایی دوای شۆڕشی ئۆکتۆبەری ١٩١٧ . لەم ساڵەدا باڵی (بەلشویکەکان) لە حزبی کۆمۆنیست بە سەرکردایەتی (لینین)، توانی بوونی یەکەمین وڵاتی سۆشیالیستی لە جیهاندا ڕابگەیەنێ و ئیمپراتوریەتی نوێ ی کۆمۆنیستی لەسەر کەلاوەکانی (ئیمپراتوریەتی تەزار) ی دابمەزرێنێ. بەڵام لەگەڵ سەرکەوتنی بەلشویکەکانیش، سەرِی دەسەڵات گرتنە دەست هەر بەردەوام بوو . شەڕی ناوخۆ بۆ کورسی دەسەڵات، شوێنی بەلشویکەکانی ڕووبەڕووی مەترسییەکی ڕاستەقینە کردبوو . هەست کردن بە تێشکان، بووە هۆی ئەوەی بەلشویکەکان بە کەڵک وەرگرتن لە توانای مرۆیی چین و توێژێک لە کارگەرو سەربازی وەفاداری خۆیان دەست بدەنە شەڕێکی ناوخۆی خوێناوی دژی نەیارەکانیان و بەردەوام بوو لەسەر و هەمان چین و توێژیش پاشان بوونە هەوێنی دامەزرانی (سوپای سوور) . هەروەها نەیارەکانیش بەردەوام بوون لەسەر چالاکییەکانیان لەسەرتاسەری خاکی سۆڤیەت، بۆ لەناو بردنی دەسەڵاتی بەلشویکەکان . ڕێبەرایەتی بەلشویکەکانیش بۆ ناسینی نەیارەکانیان و بە دواداچوون و لەناوبردنیان لە ٢٠ی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩١٧ دا بڕیاری دا بە دامەزراندنی دەزگایەکی تایبەت کە پاشان (چکا) ی ناولێنرا.

(چکا) ئەرکی بەربەرەکانی کردنی نەیارەکانی ڕژێمی تازەی پێسپێردرا کە بە هەموو تواناوە هەوڵ بدەن بۆ ناساندنی کەسانێک کە بەلشویکەکان بە (دژە شۆڕش) و (تاوانبار)، ناویان دەبەن و بە پێویستی دەزانن لەناویان ببەن . سەرۆکایەتی ئەم دەزگایە بە کەسێک بەناوی (ژرجینسکی) سپێردرا، کە پاشان بەهۆی بێ بەزەیی و

توندوتیژی لەگەڵ نەیارەکانی حکومەتی کۆمۆنیستی بە (فلێکس خوێنخۆر) و (فیلکس پۆلایی) ناوی دەرکرد.

(فلیکس ژرجنسکی) کە دەتوانین بەناوی یەکەمین سەرۆکی دەزگای سیخوڕی ڕووسیای ناو ببەین، دەسەڵاتی فراوانی و بێ وێنەیی بەخشی بوو بە ئەندامان و ماموورەکانی دەزگاکەی . ئەمانە لە یەک چالاکی فراوان دا کە لەمێژوودا بە (تیرۆری سوور) ناسراوە، بەسوود وەرگرتن لەو دەسەڵاتە فراوانە، (حەمامێکی خوێنی) گەورەیان لەسەرتاپای وولات بەرپاکرد . توندوتیژی و بێ بەزەیی ماموورەکانی (چکا) لە ماوەیەکی کورتدا ناوداریيەکی ئەفسانەییان وەرگرت، بەشێوەیەک تەنها بە بیستنی ناوی ماموری (چکا)، هەر بیسەرێک لەشی دەکەوتە لەرزین . ژیان و گیانی مرۆڤ بۆ ئەم ماموورانە هیچ نرخ و بایەخی نەبوو، تا ئەو ڕادەیەی کە هەر کەسێ گومان لێکراوی نەیاری ڕژێمی نوێ بوونایە لە شوێنە گشتییەکان لەبەر دەرگای ماڵ یان شوێنی کار و یا لە بەردەم منداڵ و خێزان و خزمەکانی دەیانکوشت

ئەگەرچی شەڕی ناوخۆ بە زوویی بە سەرکەوتنی لایەنگرانی (لینین) کۆتایی هات، بەڵام کۆتایی شەڕ، سەرەتاییەکی تازەی چالاکییەکانی (چکا) بوو . دوای ئەمە، (چکا) کەوتە دژایەتی کردنی نەیارەکانی کۆمۆنیزم لەناو ڕووسیادا و هەروەها بەربەرەکانی کەسانێکی دەکرد، کە نەیاری دەوڵەت و سەرپێچییان دەکرد و ناڕازی بوون لە کارەکانی و هەندێ جار دژە خەباتیان دەکرد . زۆری نەخایاند (چکا) بووە ئۆرگانێکی بەربڵاوی سەرتاسەری ڕووسیا . ئەم دەزگایە هەوێنی سەرەکی دامەزرانی (K.G.B) ئێستایە.

(چکا) ماوەیەک بە ناوەکانی (NKVD) و (GPU) و (MGB) ناوی دەرکرد و ئێستاش لە سەرتاسەری جیهان دایە بە (K.G.B) ناسراوە و ناوی دەرکردوە . (لونف) لە کاربەدەستە پایە بەرزەکانی

مەکتەبی سیاسی سۆڤیەت و نووسەرو دانەری کتێبی (مەشقی تایبەتی ئەندامانی (K.G.B) یە ئەو دەزگایەی تا ئێستا بیست ملیۆن مرۆڤی بێگوناهی ڕووسی لە ئۆردوگاو زیندانە تۆقێنەر و ناودارەکانی وەک (کۆمەڵە دورگەکانی گولاک) لەناو بردوە.

(لونف) دەربارەی کۆمیتەی ئاسایشی نەتەوەیی (K.G.B) دەنووسێ :- ئەم دام و دەزگایە ئۆرگانێکی سیاسی حزبی کۆمۆنیستی یەکێتیی سۆڤیەت و ماموورو کاربەدەست و کارمەندانی ئەرکەکانیان بە پێی ڕاسپاردەو فەرمانەکانی ڕێبەرایەتی حزب و دەستوور و فەرمانەکانی دەوڵەتی یەکێتیی سۆڤیەت ئەنجام دەدەن . کۆمیتەی ناوەندی حزبی کۆمۆنیست لە بڕیارە گرنگەکان سەبارەت بە چالاکییەکانی ئەم دەزگایە دەکۆڵێتەوە و بڕیاری لەسەر دەدا.

بە پێی ئەم دەربڕینە بەڕاشکاوی یە دەتوانین ئەنجامێک وەربگرین کە (K.G.B) لە ئۆرگانەکانی ژێر دەسەڵاتی ڕێبەرایەتی حزب و بە دەزگای چەکداری حزب لە قەڵەم دەدرێ و لە ڕاستیدا بە باسکی بەهێزی حزبی کۆمۆنیستی ڕووسیا دەناسرێ . بەلایەنی کەمەوە 200 (K.G.B)ئەندامی ڕەسمی جێگیری هەیە و ئەم ژمارەیە لێپرسراویەتی بەڕێوەبردنی تۆڕی گەورەو فراوانی چەند ملیۆنی لە ماموور و باوەڕپێکراو و سیخوڕ و دزە و پۆلیسی سیاسی لە ئەستۆ دەگرن.

بە پێی ووردبوونەوە لەم تێبینیانەی سەرەوە دەسەڵاتێکی فراوان دراوەتە (K.G.B) بە ڕاددەیەک کە دەتوانن لە بڕیارەکانی (مەکتەبی سیاسی حزب و دەوڵەتی سیاسی) لە زۆربەی گۆڕانکاری و ڕووداوە گرنگەگانی جیهان دەوری سەرەکی ببینێ . بەسوود وەرگرتن لەم دەسەڵاتە فراوانەش بوو کە (یوری ئەندرۆپۆف)، لە پاش مردنی (لیۆنید برژنێف)، توانی هەموو نەیارەکانی خۆی وەلانێ و ڕێبەرایەتی

حزب و دەوڵەتی ڕووسیا بە دەستەوە بگرێ . (یوری ئەندرۆپۆف) تا ئەو کاتە، لە پۆستی سەرۆکایەتی (K.G.B) کاری دەکرد و پێش ئەمەش باڵویزی ڕووسیا بوو لە چیکۆسلۆفاکیا.

## ئەركەكانی(K.G.B)

بەڵگەنامەیەكی زۆر نهێنی كە لە پاش هەڵاتنی یەكێك لە سیخوڕە ناودارەكانی ئەم دام و دەزگایە بۆ ڕۆژئاوا ئاشكراوە ئەركە سەرەكیەكانی (K.G.B) ڕوون دەكاتەوە . ئەم بەڵگەنامەیە كە ئەنجوومەنی وەزیرانی یەكیتیی سۆڤیەت بڕیاری لە سەر داوە بە (یاسای ئاسایشی نەتەوەیی) ناونراوە.

بە پێی بەندەكانی ئەم بەڵگەنامەیە ئەركی ئۆرگانەكانی (K.G.B)بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

-سیخوریكردن و بەدەستهێنانی دەنگوباس لە وولاتە سەرمایەدارەكاندا، وەك:

تێخزاندن و ناردنی هاوكارەكانی (K.G.B) بۆ ناو ناوەندە سیاسی، زانستی، هونەری، نیزامی، ئابووری، ڕاگەیاندن، سیخوڕی و ئاسایشی و .هتد، لە وولاتە سەرمایەدارەكان دا.

· خزانە ناو كۆمپانیا ئابوورییە گرنگ و ستراتیژییەكان ج دەوڵەتی بێت یان تایبەتی لە وولاتە سەرمایەدارەكان لە سەرتاسەری جیهان دا، بۆ نانەوەی گیروگرفت و زیادكردنی ناكۆكیەكان بە مەبەستی شێواندنی باری ئابووری لەم وولاتانەدا.

بەدەستهێنانی زانیاری تەواو لایەنگیری كراو لەسەر پرۆژە سیاسی، نیزامی و دام و دەزگا سیخورییەكان ولاتە سەرمایەدارەكان.

ئامادەكردنی زانیاری تەواو لەسەر پرۆژەكانی داهااتووی ناوەندە زانستی و نهێنییە زانستییەكانی ولاتە سەرمایەدارەكان . (لەم

بارەیەوە ماوەیەک لەمەو پێش کۆمەڵێک لە سیخوڕەکانی (K.G.B) لە یابان و کۆمەڵێکی تریش لە وولاتە یەکگرتووەکان، بەهۆی هەوڵدانیان بۆ بەدەستهێنانی زانیارییەکانی ئێمە لەسەر ئامێرە کۆمپیۆتێرییەکان لەم وولاتانەدا بە خەڵکی خراپ لە قەڵەم دران و دەرکران. )

خزاندنی هاوکارەکانی (K.G.B) بۆ ناو ڕێکخراوە دژە کۆمۆنیستییەکان لە دەرەوەی وولات و هەوڵدان بۆ لەبەریەک هەڵوەشان و لەناوبردنیان.

بڵاوکردنەوەی زانیاری بە درۆ و ناڕاستی دەنگ و باسی سیاسی و سەربازی لە سەرتاسەری جیهان کە لە ئەنجام دا بیرورای گشتی جیهان بەرەو پاڵپشتیکردنی سۆڤیەت ڕابکێشی.

- هەوڵدان بۆ دژە سیخوڕی و خزانە ناو دەزگا سیخوڕییەکانی دوژمن کە ئەم خاڵانە دەگرێتە خۆ:-

- لەناو وولاتدا هاوکارە گومان لێکراوەکانی سیخوڕی بێگانە دەست نیشان بکرێن.

بە هەر شێوەیەک بێت چالاکییەکانی دەزگا سیخوڕییەکانی وولاتە بێگانەکان و هاوکارەکانیان لەناو خاکی یەکیتیی سۆڤیەت پووچەڵ بکرێتەوە.

- بە شێوەیەکی فراوان چالاکی نواندن لەناو جەماوەر، سوپا، هێزە سیانییەکان، ناوەندە خەبەری و گۆڤارو بڵاوکراوەکان، دانشگاکان، سنوورەکانی وڵات و بەشێوەیەکی گشتی لە سەرتاسەری چوارچێوەی خاکی سۆڤیەت لە قوتابخانە سەرەتاییەکانەوە بگرە تا مەکتەبی سیاسی حزب دەبێ کاری تێدا بکەن.

• هاوکارەکانی (K.G.B) دەبێ پارێزەری نهێنییە نیزامی و دەوڵەتییەکان بن و بە هاوکاری کاربەدەستە دەوڵەتی و سوپاییەکان لە دەست گەیشتنی دوژمن بەم زانیارییانەی پێشگیری بکەن.

لە باڵوێزخانەکانی ڕووسیا لە وولاتانی دەرەوەدا بەشێکی نهێنی تێدایە کە ئەندام کارمەندانی هەموویان (K.G.B) ن، لە پایتەختی وولاتانی جیهاندا لەناو باڵوێزخانەکان دا، چالاکی یە سیخوڕییەکان لە وولاتی خانە خوێ دا بەڕێوەدەبەن.

لەناو خاکی یەکێتیی سۆڤیەتیش دا، (K.G.B)ئەرکیەتی باڵوێزخانەکانی وولاتانی دەرەوە بخاتە ژێر چاودێرییەوە.

-دژایەتی کردن و خەباتی بەردەوام دژی ئەندامانی دژە سۆڤیەتی، ئەم خاڵانە دەگرێتە خۆ:-

• خەباتکردن دژی بەرگری لە مەزهەب دژی کلێساکان و ئەندامانی کۆمەڵگا مەزهەبییەکان کە دژی ئایدیۆلۆجیەتی مارکسیزمن و پێویستە ئەمانە بخرێنە ژێر چاودێری ووردەوە.

دامەزراندنی پاسەوان بۆ کاربەدەستە حزبی، دەوڵەتی، پاڵێوراوانی (CCC.P – SU) و مەکتەبی سیاسی.

کردنی دابین سەلامەتی پەیوەندییەکانی تەلەفۆنی کاربەدەستانی دەوڵەتی و سوپایی لە بە دزی گرێدانە گفتوگۆکانیان و کۆنتڕۆڵ کردنی نووسراوی هاووڵاتیانی ڕووسی و چاودێری کردنە سەر ڕادیۆ بیانییەکان کە بە زمانی ڕووسی پرۆگرام بۆ یەکێتیی سۆڤیەت بڵاودەکەنەوە و درۆ خستنەوەی پرۆپاگندەکانیان.

بە وردبوونەوە لەو ئەرکانەی بۆ (K.G.B) دانراون بۆمان دەردەکەوێ کە ئەم دەزگایە چالاکییەکانی لە ڕووداوە سیاسی یە نێو نەتەوەیی

یەکانەوە تا چاودێری کردنی کارگەرێکی نارازی یا خزمەتێکی کلێسا دەگرێتە خۆ. لە هەمان دەستووردا لەژێر سەردێری :- (دەزگای کاروباری دژە زانیاری K.G.B لە بابەت چالاکییەکانی بە دەست هێنانی دەنگوباس و سیخوڕی کردنەوە جارێکی تر ڕوونی کردۆتەوە کە:

(سیاسەتی دەرەوەی دەوڵەتی یەکیتیی سۆڤیەت – دیاریکەری چالاکی یە سیخوڕییەکانی. (K.G.B)

دەتوانین ئەم ڕاسپاردەوە ڕێنماییانەی لە ڕووداوی ئاشکرابوونی تۆڕی گەورەی سیخوڕانی ڕووسی لە بریتانیا کە زیاتر لە ١٠٠ سیخوڕی ڕووسی بوون و لە ژێر پەردەی دیبلۆماس و بازرگان لە بریتانیا نیشتەجێ ببوون . یان لە ڕووداوی ئاشکرابوونی تۆڕی سیخوڕی لە بەلجیکا و فەرەنسا هەست پێ بکەین. ئێستاش واباشە بڕوانینە هەندێ ڕووداوی جۆراجۆر کە ڕاستی ڕووداوەکانیان لە کۆمەڵگای مرۆڤایەتیەوە ئاشکرانین و سەرپۆش کراون کە پرپەتی لە خاڵی لە بایەخ لە چالاکییەکانی هاوکارانی (K.G.B) کە لەسەرتاسەری جیهان دا سەرسوڕهێنەر بوونە.

# میدالیەک بۆ(K.G.B)

لە ڕوانگەی یەکیتیی سۆڤیەتەوە، (ناتۆ (NATO – بە دوژمنی سەرەکی دەژمێردری و بۆیە (مۆسکۆ) هەوڵی زۆر دەدات لەنێوان وولاتانی ئەندامانی (پەیمانی ئەتلەنتیکی باکوور – ناتۆ)، ناکۆکی و پارچە پارچەیی دروست بکات . بۆ پیادە کردنی ئەم ڕێبازەش (کرملین) سیاسەتی خۆی بۆ بۆ دوو ڕێڕەو دابەش کردووە:-

یەکەمیان بریتی لە : سیاسەتی ڕەسمی دەوڵەتی ڕووسیا بۆ بەربەرەکانی کردنی پەیمانی (ناتۆ.

بۆ نموونە ڕێککەوتنێک لەنێوان دوو دەوڵەتی یەکیتیی سۆڤیەت و فەرەنسا مۆرکرا و لێپرسراوانی هەردوو وولات سەردانی وولاتی یەکتریان کرد و چاوپێکەوتن لەسەر ئاستی وەزیران دا ئەنجام درا . (ئەندرێ گرۆمیکۆ) ی وەزیری کاروباری دەرەوەی ڕووسیا چەندین جار چووە پاریس و لە بابەت کاروباری پەیوەندار بە هەر دوو لاوە لەگەڵ کاربەدەستانی فەڕەنسا گفتوگۆیان کرد . لە ١٥ ی ئایاری ١٩٦٥ دا (ئەندرێ گرۆمیکۆ) لە ڤیەننا لەگەڵ (کۆدۆمۆرڤیل) ی وەزیری کاروباری دەرەوەی ئەو کاتەی فەڕەنسا دیداری کردو پاش ئەمە لە ٢٨ی تشرینی یەکەم تا ٢ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٦٥ (کۆدۆمۆرڤیل) سەردانی ڕووسیای کرد . بابەتەکانی باسکراوی دیدارەکە بریتی بوون لە چاکتر کردنی پەیوەندی دوو قۆڵی گیروگرفتەکانی ئەورووپا و گیروگرفتی هەردوو ئەڵمانیا.

له ساڵی ١٩٦٥ دا بە پێی ڕێککەوتننامەیەک یەکێتیی سۆڤیەت ڕێگای پێدرا لە سیستەمی تەلەفزیۆنی ڕەنگاوڕەنگی فەڕەنسا کەڵک وەربگرێ. لە تشرینی دووەمی هەمان ساڵدا شاندەکێک لە زانا گەردوونییەکانی ڕووسی بە سەرۆکایەتی پرۆفیسۆر (سدف) چوونە پاریس و لەگەڵ زانا فەڕەنسییەکان لە بابەت هەڵدانی مانگی دەستکردی فەڕەنسی بۆ ئاسمان بە مووشەکی ڕووسی گەیشتنە ڕێککەوتنێک . لە ساڵی ١٩٦٦ دا گفتوگۆ لە بەینی هەردوو لا بەردەوام بوو . لە ٢٠ی حوزەیران تا یەکی تەمموز (جەنەڕاڵ دیگۆل) سەردانی مۆسکۆی کرد و هەروەها بە دوای ئەویشدا (ئالان پۆرفیت) ی سیاستمەداری فەڕەنسی چووە مۆسکۆ . لە ١٥ی تشرینی یەکەم کەشتیەکی جەنگی ڕووسی هاتە بەندەری (تولون) ی فەڕەنسا هەروەها (میشیل دوبره) ی وەزیری ئەو کاتی بازرگانی و ئابووری فەڕەنسا بە مەبەستی گفتوگۆکردن لەگەڵ لێپرسراوانی ئابووری ڕووسی و ئاڵوگۆڕکردنی بەڵێن نامەی ئابووری چووە مۆسکۆ.

بەدرێژایی ساڵی ١٩٦٦ ی زایینی قەبارەی پەیمانکاری و ڕێککەوتنەکانی نێوان هەردوو وڵات گەیشتە ئاستێکی بەرزو کار گەیشتە ئەوەی کە لە ٥ی ئایار ڕێککەوتنی گۆڕیەوەی لێکۆڵینەوە ئەتۆمییەکانی لەسەر ئاستێکی فراوان لە بەینی (کۆمیتەی کەڵک وەرگرتن لە ووزەی ئەتۆمی ڕووسی) و (ئەنجومەنی ووزەی ئەتۆمی فەڕەنسی) مۆر بکرێ. لەم ماوەیەدا ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی دەوڵەتی ڕووسیا و دەزگاکانی بڵاوکردنەوەی دەنگ و باسی ئەم وولاتە دەستی کرد بە جووڵاندنی هەستی نەتەوایەتی میللەتی فەڕەنسا و فەڕەنسایان بە دەسەڵاتدارێکی جیهانی کە دەتوانێ دەوری کاریگەر و چارەنووس ساز لە سەر ئاستی جیهاندا ببینێ ناودەبرد . ئەم پڕوپاگەندانە تا ئەو ئاستە دەوری خۆی بینیبوو کە میللەتی فەڕەنسا ڕێگەیان لە ڕێبەرانی خۆیان گرت کە چیتر ئاسانکاری (تسهیلات) بۆ بەرنامەکانی واشنتۆن نەکەن .

بیروڕای گشتی فەڕەنسا بەو ڕاددەیە جوولێنرابوو کە بووە هۆی ئەوەی (جەنەڕاڵ دیگۆل) ناچار بکرێت لە حاڵەتێکی سەرسوڕمان و بێبڕوایی جیهاندا لە ١١ی ئاداری ١٩٦٦ بە ڕەسمی لە بڵاوکراوەیەکدا کە خۆی خوێندیەوە هاتە دەرەوەی فەڕەنسا لە پەیمانی (ناتۆ) ڕابگەیەنێ . ئەم هەنگاوە مۆسکۆی زۆر شادمان کرد و بڵاوکراوەکانی ڕووسیا فەڕەنسایان بەناوی وولاتێکی ئاشتیخواز ناودەبرد.

)کرملین) لە بێهێزبوونی (ناتۆ) لە دوای دەرچوونی فەڕەنسا لەم پەیمانە یەکجار زۆر خۆشحاڵ ببوو و ئەم شادیەشی بە هیچ شێوەیەک نەدەشاردەوە سەرکردەکانی (K.G.B) پاش ئەم سەرکەوتنەی کە توانیبوویان تیایدا دەوری خۆیان لەم یارییە گەورەیەدا ببینن بە میدالیای پلەی یەکەمی سۆڤیەت خەڵات کران . دەرچوونی فەڕەنسا لە پەیمانی (ناتۆ) نموونەیەکی زۆر باش بوو بۆ پۆلەکانی فیرگەکانی (K.G.B) و بووە سەردێڕی وانەیەک کە لەم پۆلانەدا دەگوترایەوە.

لە ساڵی ١٩٦٨ ی زاییندا لێپرسراوی قوتابخانە ژمارە (٣٣١) ی (K.G.B) لە ووتارێکی دا کە لە (بابەت چالاکی ماموورەکانی (K.G.B)لە دەرەوەی وولات) پێشکەشی دەکرد بە ڕاشکاوی دەری بڕی کە بە بۆچوونی (مەکتەبی سیاسی حزب) ڕووداوەکانی فەڕەنسا بەرهەمی سەرکەوتنەکانی (K.G.B) بووە.

## دیگۆڵ

## (چین) و بازاڕی هاوبەشی ئەوڕوپی و(K.G.B)

(بازاڕی هاوبەشی ئەوڕوپا) ش مۆسکۆی بێزار و ڕقی لێدەبووەوە . ڕووسیا ئەورووپایەکی لاوازو پارچەپارچەی دەوێت و سەرکردەکانی ئەم وڵاتە خوازیاری لەبەر یەک هەڵوەشانەوەی یەکێتیی سیاسی، نیزامی، ئابووری، ئەورووپان . لەم بارەیەوە ڕێبەرانی ڕووسیا هەمیشە هەوڵیان داوە ڕێککەوتنی دوو لایەنە لەگەڵ وڵاتانی ئەندامی (پەیمانی بازاڕی هاوبەش) ببەستن . هەنگاوێکی ئاواش لە ساڵی ١٩٧٤ ی زاییندا کاتی ڕێککەوتن لەگەڵ ئەڵمانیای فیدراڵ هاتەدی.

بۆ پیادەکردنی ئەم سیاسەتەش (K.G.B) ئەندامانی بێهێزبوونی پەیمانی (ناتۆ) یانی فەرەنسا و ئیتاڵیای هەڵبژاردبوو کە لەوێدا حزبە کۆمۆنیستەکان مەیدانێکی باش و گونجاویان بۆ کارکردن و چالاکییەکانیان دۆزیبۆوە . دەزگا ڕاگەیاندنە گشتیەکانی ڕووسی کە دام و دەزگایەکن لەژێر دەسەڵاتی (مەکتەبی سیاسی) ماوەیەکی باش لەم بوارەدا کاریان کرد بۆ ئەوەی ئەوڕوپا لەبەریەک هەڵبوەشێنن.

بێجگە لە ئەوڕوپا، ڕووسیا لە چالاکی تێکدەرانە بەرزی (K.G.B)بەشێکی تایبەت بە (چین) ی دامەزراند. ماموورە تایبەتییەکانی کە چالاکی جۆراوجۆر دژی چین ئەنجام دەدەن لەم بەشەدا دەرس خوێندن . جێگای سەرنجە بۆ ڕاهێنان و فێرکردنی ماموورانی ((K.G.B) بۆ بەشی چین لە وڵاتەکانی ڕۆژهەلاتی دووریش کە لەژێر دەسەڵاتی مۆسکۆدان لەلایەن (K.G.B) یەوە ناوەندی ڕاهێنانی تر (فێرگە) بۆ ئەم بەشە دامەزراوە.

له رووسیادا ئەم قوتابخانەیە لەسەر سنوورەکانی چین دامەزراون . بەڕێوەبەرایەتی سێ یەمی بەڕێوەبردنی ((K.G.B) دەکەوێتە شاری (خاباڕۆفسک) نزیک بە سنووری چین له باکووری (ڤلادیڤستۆک) . ئەرکەکانی ئەم بەڕێوەبەرایەتییە بەدواداچوونی چالاکیە فراوانەکانی سیخوڕی بەدەستهێنانی دەنگوباس و پیادەکردنی سیاسەتەکانی مەکتەبی سیاسییە لە بابەت چینەوە . لە ساڵی ١٩٦٢ ی زایینی کە پەیوەندی ڕووسیا و چین تێکچوو بوو دەوڵەتی ڕووسیا ((K.G.B)ی تاوانبار کرد کە نەیتوانیوە لە کاتی خۆیدا کاردانەوەکانی دەوڵەتی چین و گۆڕانکارییەکانی ئەم وڵاتە پێشبینی بکات . لەو کاتەوە تا ئێستا چالاکی سەرەکی (K.G.B) ڕوو لە دامەزراندنی سیستەمێکی فراوان و دڵنیاکەری بەدەستهێنانی دەنگوباس بووە لە بوارەکانی سیاسی، سەربازی . هتد، لە سەرتاسەری خاکی چین . تا ماوەیەک لەمەوبەر کە مەودای دامەزراندنی ماموورانی چینی لە (K.G.B) دا نەبوو لە چینیەکانی دانیشتووی سیبیریا کەڵکی وەردەگرت . هەروەها (K.G.B)لەژێر ناوی ڕاوێژکار ئابووری و وەک ئەمانە ماموورێ لە وڵاتانی جیهانی سێ یەم کە لەژێر دەسەڵاتی ڕووسیادا بوون بۆ چین دەناردن .

(K.G.B)ناوەندێکی فێرکردنی باڵای لە سەمەرقەند هەیە کە لەوێدا هەڵسوڕێنەرانی حزبە کۆمۆنیستییەکانی وڵاتانی جیهانی سێ یەم و کاربەدەستانی دەرەوەی ڕووسی ئامادەو فێردەکرێن . قوتابیانی ئەم فێرگەیە لە خەڵکی وڵاتانی ئەفریقایی و ئاسیایی پێک دێن و خولی فێرکردن تیایدا ١٠ ساڵە.

## هەردوو ئەڵمانیا و(K.G.B)

یەکێکیتر لە مەبەستەکانی تری چالاکی ( (K.G.B) لە دەرەوەی خاکی سۆڤیەت، ئەڵمانیای ڕۆژئاوایە . دەبێ ئەوەش بزانین کە چالاکییەکانی (K.G.B) لە ئەڵمانیای ڕۆژئاوا کەم نییە و بەڵکو لەهەردوو ئەڵمانیادا خاوەنی تۆڕێکی فراوانە . من خۆم چوار ساڵ لە بەشی ئەڵمانیای ڕۆژهەلات لە (K.G.B) کارم کردووە و لەسەر چالاکییەکانی بە ووردی ئاگادارم . لەم بەشەدا نزیکەی شەست بەڕێوەبەرایەتی هەیە کە لە سەرتاسەری ئەم وولاتەدا بڵاوبۆتەوە . هەزارو پێنج سەد مامووری فێرکراو و شارەزا و خاوەن ئەزموونی ڕووسی بەڕێوەبەرایەتی کردنی ئەم تۆڕە فراوانە لە سەرتاسەری خاکی ئەڵمانیای ڕۆژهەلات لە ئەستۆ دەگرن.

ماموورانی مەیدانی (K.G.B) لەسەر خاکی ئەڵمانیای ڕۆژهەلات، هەروەک کاربەدەستانی ئەم سازمانە لەسەر خاکی ڕووسیا خاوەنی دەسەلات و توانای بێ وێنە و فراوانن . تەنها جیاوازییەک کە هەبێ، ناتوانن هاوولاتیانی ئەڵمانیای ڕۆژهەلات بگرن و ئەم کارە لە ڕێگای کاربەدەستانی سازمانی ئاسایشی ئەڵمانیای ڕۆژهەلات (M.F.S) ئەنجام دەدرێ (K.G.B) . خۆی داوای مۆڵەتی گرتنی هاوولاتیانی ئەڵمانیای ڕۆژهەلاتی لەم دەولەتەی کە لەلایەن سووپای سوورەوە داگیرکراوە نەکردووە تا بە ڕووالەت نیشان بدا کە ڕێز لە سەربەخۆیی ئەم وولاتە دەگرێ . جگە لەم حاڵەتە ڕووالەتییە (K.G.B) ڕێزی تر لە سەربەخۆیی ئەڵمانیای ڕۆژهەلات ناگرێ و بە ڕەسمی کەڵک لە هاولاتیانی ئەم وولاتە وەردەگرێ بۆ چالاکییە سیخوڕییەکان و چاودێری سیاسی خەڵک و بابەتی تری ئاسایشی. سەیر ئەوەیە (M.F.S)ئالەتێکە لەژێر دەستی (K.G.B) دا و وەک پۆلیسی ئاشکرای

ئەم دەزگایە کاردەکات . ئەفسەرانی (K.G.B) بە ئاشکرایی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات بە کۆماری شازدەهەمی سۆڤیەت ناودەبەن.

ئەو ماموورانەی کە لەلایەن (K.G.B) دەنێردرێنە ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات پەیوەندیان بەدوو بەڕێوەبەرایەتی سەرەکی یەکەم و بەڕێوەبەرایەتی سەرەکی سێ یەم هەیە . ئەرکی ئەم دوو ئۆرگانەی (K.G.B)سیخوڕی کردنە لە دەرەوەی وولات . ئەم دوو بەڕێوەبەرایەتیە جگە لە ئەرکی پارێزگاری هێزەکانی ڕووسی جێگیر لە ئەڵمانیا، هەروەها چالاکی سیخوڕی و دژە سیخوڕی دژی هێزەکانی ئەمریکا و بەریتانیا و فەرەنسا و ئەڵمانیای ڕۆژئاوا ئەنجام دەدەن . بۆ ئەنجامدانی ئەم ئەرکەش لەلایەن (K.G.B) یەوە لەنێو سەربازەکانی ئەم هێزانە سیخوڕ دەکرێن و پەیدا دەکرێن.

لە ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات خەڵکێکی کەم مۆڵەتی پێدەدرێت سەردانی ئەڵمانیای ڕۆژئاوا بکات و ئەمانەش بە ڕاسپێردراوی (K.G.B) ناودەبرێن، بەو مانایەی کە لە ڕێگای چاوپێکەوتن زانیاری پێویستیا بۆ کۆدەکەنەوە . بۆ نموونە (شۆڵتز) کە خەڵکی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵاتە و هاوکارە لەگەڵ (K.G.B) بە ڕواڵەت وا مۆڵەتی پێدەدرێت کە سەردانی کەسوکاری بکات لە ئەڵمانیای ڕۆژئاوا و دەچێتە شاری (بۆن . ) (K.G.B)ئاگادارە لەم شارەدا ڕادیۆی دەنگی ئەمریکا، ئێزگەیەکی هەیە . مەبەست لە سەفەری (شۆڵتز) ئەوەیە کە بە بەردەم ئەم ئێزگەدا تێپەڕێ و ژمارەی سەیارە سەربازی و پاسەوانەکانی دەوری ئێزگە و دەرگاکانی چوونە ژوورەوە و هەر بابەتێکی تر سەرنج ڕاکێش بنوسێ و ئەگەر بکرێ نەخشەیەک لەم شوێنە لە مێشکی خۆیدا تۆمار بکات و بە کامیرای تایبەتی سیخوڕی کە لەناو چەخماخێک پاکەتی جگەرە یا لەناو دوگمەی سەردەست جێگای بۆ کراوەتەوە وێنە بگرێ . بە بەدەستهێنانی ئەم زانیاریانە و بەراوردکردن و هەڵسەنگاندنیان (K.G.B) ئاگاداری گۆڕانکارییەکان دەبێت و هەمان ڕێگاش بەکاردەهێنرێ بۆ بنکە

سەربازی و پایەگاکانی هێزەکانی هاوبەشی ئەڵمانی، فەڕەنسی، بریتانی و ئەمریکایی لەم دیوی دیواری بەرلین دا.

هەروەها مامووری (K.G.B) کە لەژێر پەردەی سەفەر دەچێتە ئەڵمانیای ڕۆژئاوا لەماوەی مانەوەیان دا لەم وولاتە دەست دەکەن بە لێکۆڵینەوەیەکی فراوان لەسەر تایبەتمەندیەکان و ڕووحیەتی هاوولاتیانی ئەڵمانیای ڕۆژئاوا و ئەمریکی و بریتانی و فەڕەنسییەکان کە بەرژەوەندی زۆریان لەم وولاتەدا هەیە . مەبەست لەم لێکۆڵینەوانە هەڵسەنگاندنی خاڵی لاواز و تایبەتمەندی ئەو خەڵکانەیە بۆ ئەوەی لە داهاتوودا بواری بەکارهێنان بۆ (K.G.B) بزانرێ.

(K.G.B)زۆرترین ماموورەکانی خۆی لە ئەڵمانیای ڕۆژئاوا تا ئێستا لەو کەسانە هەڵبژاردووە کە سەردانی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات دەکەن و بەمەبەستی گەشتوگوزار دێنە ئەو وولاتە . ناوی ئەو هاوولاتیانەی ئەڵمانیای ڕۆژئاوا کە سەردانی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات دەکەن لە دۆسیەکانی سازمانی ئاسایشی نەتەوەیی (M.F.S) و پۆلیسی سیاسی ئەم وولاتە تۆمار دەکرێن . لە هەمان کاتدا ناوی زۆربەی ئەم توریستانە لە ئەرشیفی (K.G.B) تۆمار و هەڵدەگیرێ . بۆ هەر کەسێ کە لە ئەڵمانیای ڕۆژئاوا یا وولاتانی تری سەرمایەدارییەوە کە سەردانی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات دەکات کارتێکی تایبەتی بۆ پڕ دەکرێتەوە لە بەڕێوەبەرایەتی پۆلیس کە هەمو ئاوات و خواستنەکانی ئەو کەسەی تێدایە کە لە هەردوو ئەڵمانیا هەیەتی . هەروەها زانیاری تەواو لەسەر کارو ژیان و خزمان و کەس و کاری ئەم کەسە لەم کارتەدا تۆمار دەکرێت و دەست نیشان دەکرێت کە کام یەک لەمانە بەهۆی پلە و پایەی کاری دەستیان دەگاتە بەڵگەنامە ڕێکخراوە گرنگەکان (وپائق منقمە مهمە) . ئەگەر لەنێوان ئەمانەدا کەسێکی جێگا مەبەستی (K.G.B) هەبێت ئەوا بەزوویی ماموورانی دامەزراندنی خۆی ڕادەسپێرێ کە ئەفسەری ڕەوانی و هەموو توانایەکییان هەیە بۆ بەداو گرتنی ئەو کەسە

دەیکاتە ماموورى هێنانە ژێربارى ئەو کەسە . بۆ ئەم کارەش شێواز و ڕێگای جۆراوجۆر هەن . بە پارە ڕازی کردن وە یا پەنا دەبرێتە بەر (شانتاژ) . زۆر جار ئەم کارە بەهۆی ژنێکی جوان یان پیاوێکی دڵگیر ئەنجام دەدرێ . زۆر بەکەمی دیتراوە خەڵکی ڕۆژئاوایی بەبەڵگەی سیاسییەوە، ئامادەیی هاوکاری لەگەڵ (K.G.B) بووبێت . من دەبێ دان بەوە دابنێم کە زۆربەی چالاکییەکانی بە داوگرتنی سیخوڕی لە هاوڵاتیانی ڕۆژئاوایی لە ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات هەمیشە سەرکەوتوو بووە . لەم کارەشدا بوار خۆشکردن بۆ کەسی مەبەست کە ڕێگای نەجات بوونی نەبێت ڕۆڵی زۆر گرنگ و سەرەکی دەبینێ.

ئەگەر بۆ ئەم مەبەستە پارەو شتە ڕاکێش کەرەکانیتر تەنانەت (شانتاژ) یش دەوری نەبوو ڕێگای ترساندنی ڕاستەوخۆ بەکاردەهێنرێ . ئەو کەسەی ئامادەی هاوکاری نەبێت پێی دەگوترێ ئەگەر هاوکار نەبێت، ئەوا بە سیخوڕ یا کاری تر خەرابکاری دژی یەکە سەربازییەکانی ڕووسی یا ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات تاوانبار و سزا دەدرێ دەخرێتە زیندانەوە . واتە کەس نیە نەجاتی بێ و بە ناچاری ئامادەی هاوکاری دەبێت.

لەوانەیە وا بیربکەیتەوە کەسێک کە لەژێر پاڵەپەستۆی جۆراوجۆردا ناچار بە هاوکاری کرابێت دوای گەڕانەوەی بۆ وڵاتی خۆی لێپرسراوانی وڵاتەکەی ئاگادار دەکاتەوە کەچی (K.G.B) بیری لەم کارەش کردۆتەوە و بۆ جڵەوکردنی ئەم کەسانە بۆ ئەم مەبەستە بەڵگەنامەیەکی مۆرکراوی لێوەرگرتووە کە ناوەڕۆکەکەی باس لە هاوکاری ئەو کەسە دەکات لەگەڵ (K.G.B) کە مێژووەکەی بە مەبەستی تایبەت دەگەڕێتەوە بۆ چەند ساڵ لەمەوبەر تا وا پێشان بدات کە ئەو کەسە دەمێکە هاوکاریان دەکات . بەم شێوەیە هەموو ڕێگایەکی هەڵاتن لەبەردەم ئەم نێچیرە دادەخرێت و ماوەیەک کە بەسەرچوو لەگەڵ بارودۆخەکە ڕادێ و ڕام دەبێ . بێگومان پارەش وەردەگرێ و

ئەمەش خۆی لە خۆیدا هۆیەکی تری بەردەوامی یە لەسەر هاوکاری کردن.

ماموورانی (K.G.B) بەناوی ڕۆژنامەنووس نوێنەری ئابووری ڕاوێژکاری فەرهەنگی و ناوی تردا دەچنە ڕۆژئاوا و دەست دەکەن بە چالاکی کردن بۆ بە داوگرتنی هاوکاری تازە لەم وولاتەدا و بەتایبەتی لە شاری بەرلینی ڕۆژئاوا کە پێی دەڵێن (شاری ئازاد) . (بەرلینی ڕۆژئاوا) بۆ ماموری (K.G.B) وەک ماڵی خۆی وایە . هاوکارو ماموری تازە پەیدا دەکا و لە شوێنی تایبەت کۆبوونەوەیان لەگەڵ دەکەن . گفتوگۆ تەلەفۆنیەکان کۆنترۆڵ و وەزعی سیاسی و سەربازی دەخەنە ژێر چاودێرییەوە.

برژنێف

## سەرگوزشتەی نەقیب گالان

دەتوانرێ سەرگوزشتەی (نەقیب گالان) وەک نموونەیەک نیشان بدرێت بۆ ئەو ڕێگایانەی (K.G.B) بەکاری دەهێنا، بۆ بەداوگرتنی هاووڵاتیانی وولاتانی تر بۆ سیخوڕی کردن.

)نەقیب گالان) نوێنەری نیزامی ئیسپانیا بوو لە تورکیا کە پاشان بە هەمان پلە گوازرایەوە بۆ باڵوێزخانەی ئیسپانیا لە قاهیرە . بەشێوەیەکی ئاسایی باڵوێزەکان کاردارەکان (قائم بالاعمال) و نوێنەرانی ئابووری، نیزامی، ڕاگەیاندن و بەشێوەیەکی گشتی شاندەکی دبلۆماسی وولاتە جۆراوجۆرەکان لە پایتەختی وولاتێک دا بەهۆی بەشداری بوون لە میوانداری و کۆبوونەوە هاوبەشی یەکان یەکتر دەناسن . (نەقیب گالان) یش کە نوێنەری نیزامی وولاتەکەیەتی لە قاهیرە بەهەمان شێوە نوێنەرانی نیزامی باڵوێزخانەکانی وولاتانی دەرەوە لە قاهیرە و لەمانەش هەندێ لە هاووڵاتیانی ڕووسی دەناسی.

ڕۆژێک کە (گالان) کاری زۆری بوو و لە نووسینگەکەی خۆیدا لە دوای کاتی دەوام ناچار بوو بمێنێتەوە . ماوەیەک پاش کاتی دەوام لەو کاتەی دا کە هەموو کارگەرو کاربەدەستانی نووسینگەی نوێنەرایەتی نیزامی ئیسپانیا لە قاهیرە ڕۆیشتبوونەوە لە نووسینگەی خۆی دەهاتە دەرەوە تا بچێتەوەماڵەوە . لەبەر دەرگا تووشی نوێنەری نیزامی ڕووسی و جێگرەکەی بوو کە خەریکی پەڕینەوە بوون لە شەقام وا خۆیان نیشان دا کە بە ڕێکەوت بەوێدا تێدەپەڕن . ڕووسەکان کەوا خۆیان پێشان دەدەن کە بە ڕێکەوت چاویان بە (نەقیب گالان) دەکەوێ لێی نزیک دەکەونەوە و پێی دەڵێن:-

- تا ئێستا کارت دەکرد ؟!

پاشان دەڵێن :- ئێمە ڕێگایەکی زۆرمان بە پێ بڕیوە ماندووبووین . ئایا میوانداریمان ناکەن تۆزێ پشوو بدەین و چایەک لە نووسینگەی ئێوەدا، بخۆینەوە ؟. !

)گالان) وەڵام دەداتەوە و دەڵێ:- خزمەتکارەکان ڕۆیشتوون و کەس نیە چامان بۆ لێبنێ.

ڕووسەکان دەڵێن :- باشە، هیچ نەبێ پەرداغێک ئاوی خواردنەوەمان بدەیە زۆر ماندووین.

)نەقیب گالان) بەشەرم دادەکەوێ و ناچار دەبێ بیانباتە نووسینگەکەی خۆی و ئاویان بۆ دێنێ.

نوێنەری نیزامی ڕووسی دەڵێ :- بەڕاست، کاتێ دەهاتینە ئەم لایە لە ڕێگا پارەیەکی زۆریان پێدام، چونکە میوانم گەر دەکرێ تکات لێدەکم پارەکە لای خۆتان بخەرە سندووقی نوێنەرایەتی تا بەیانی یەکێک دەنێرم وەری بگرێتەوە.

)نەقیب گالان) بەهۆی نەبوونی ئەزموونی تەواو بێئاگایی لە جەوهەری ڕۆڵی نوێنەرایەتی نیزامی ڕووسی و جێگرەکەی دەڵێ:

- باشە، لاریمان نییە. !

پاشان لەگەڵ نوێنەری نیزامی ڕووسی دەچێتە نزیک دەرگای قاسەی باڵوێزخانەی ئیسپانیا بەشی نوێنەرایەتی نیزامی و دەرگاکەی دەکاتەوە . نوێنەری نیزامی ڕووسی پارەکان دەردێنێ و پاشان بە بیانووی ئەوەی دەیانژمێرێ ئەسکەناسە گەورەکان بەشێوەیەکی ئاشکرا دەخاتە دەستی (نەقیب گالان) . لە هەمان چرکەدا ڕووناکی فلاشی کامیرا (گالان) ئاگادار دەکات کە جێگرەکەی نوێنەری نیزامی ڕووسی خەریکی وێنەگرتن دەبێت و لەم حاڵەتەدا کە دەرگای قاسەکە کراوەتەوە و ڕووسەکە

خەریکی پارە تەسلیم کردنە بە (گالان) چەند وێنەیەک دەگیرێ . پاشان نوێنەری نیزامی ڕووسی خۆی دەکێشێتەوە و دەمانچەکەی دەردێنێ و دەڵێ :- کەس لێرە نیە و دەتوانم بەم دەمانچەیە کە دەزگای کپ کردنی دەنگ (کاتم الصوت) ی هەیە بتکوژم و هەموو سەنەد و بەڵگەنامەکان لەگەڵ خۆمدا ببەم بەڵام ئەو کارە ناکەم، چونکە دەمەوێ وەک هاوڕێیەک لەگەڵ تۆدا بمێنمەوە . ئەم وێنانە ئامادە دەکەم ئەگەر لە داهاتوودا هاوکاریت کردین ئەوە دەبێتە هاوڕێی ئێمە و بە پێچەوانەوە وێنەکان بە نامەیەکی بەبێ ئیمزاوە دەنێرین بۆ ناوەندی بەڕێوەبەرایەتی سووپای ئیسپانیا . ئێستاش خۆتان دەزانن و پاشان هەردووکیان نووسینگەکە بەجێ دەهێڵن.

(گالان) کە لەم ڕووداوە دووچاری ترس و دڵەڕاوکێ ببوو تا بەیانی خەوی لێناکەوێ . بەیانی بە خەواڵوویی و بێتاقەتی دەچێتە باڵوێزخانە و بەبێ باسکردنی ڕووداوەکە دەڵێ :- من زۆر نەخۆشم ئەمڕۆ دەبێ بگەڕێمەوە (مەدرید) . هەمان ڕۆژ دەگەڕێتەوە و ڕووداوەکە لێرەدا بە ڕواڵەت کۆتایی دێت.

بەڵام چەند ساڵ دوایی یەکێک لە هاوکارەکانم منی ناردە مەدرید بۆ چالاکی سیخوڕی لەوێدا . (سەرۆکی چالاکییەکانی بەشی ئەورووپای ڕۆژئاوا و باشووری) پێش ناردنی ئەم کاربەدەستە بۆ (مەدرید) پێی دەڵێ :- ئێمە لە ئیسپانیا دۆستێکمان هەیە بەناوی (نەقیب گالان) کە دەتوانن حیساب لەسەر هاوکاری و یارمەتی ئەودا بکەن . مامووری (K.G.B) بۆ ئەنجامدانی ئەوەی پێی سپێردراوە دەچێتە ئیسپانیا، بەڵام (نەقیب گالان) نادۆزێتەوە . ناوبراو لەلایەن (پۆلیسی نێونەتەوەیی واتە Interpol) لە ئیتاڵیا دەناسرێ و دەستگیر دەکرێ . پاش پشکنینی ئەم مامموورەی (K.G.B) لەناو دەفتەری بیرەوەرییەکانی ڕۆژانەی دا ناوی (نەقیب گالان) دەدۆزنەوە کە وەک دۆستێک دەبێ سەردانی بکات و پشتی پێ ببەستێ . لە ڕێگای (پۆلیسی نێونەتەوەییەوە

(Interpol – ناوەندی سوپای ئیسپانیا ئاگاداری بابەتەکە دەبێت .
هەرزوو (نەقیب گالآن) دەستگیر و باس لە سێدارەدانیش دەکری . پاش
لێکۆڵینەوەیەکی زۆر بۆ دادگا ڕوون دەبێتەوە کە (گالآن) خیانەتی
نەکردووە و هیچ زانیارییەکی نەداوەتە (K.G.B) ، بەڵام لەبەر
شاردنەوەو باس نەکردنی ڕووداوەکە بۆ لێپرسراوانی نەداوەتە
(K.G.B)، بەڵام لەبەر شاردنەوەو باس نەکردنی ڕووداوەکە بۆ
لێپرسراوانی خۆی لە قاهیرە بە ١٠ ساڵ زیندان حوکم دەدرێت.

(نەقیب گالآن) لەم دوایی یەدا لە زیندان ئازاد کراوە، بەڵام ئەو
گەنجە جوان و قەدو باڵا ڕێک و پێکە ئێستا پیرەمێردێک ئیتر کەس ئەو
ناناسێتەوە.

## مامووریەتی (K.G.B) لە ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات

(ئەلسەندەر ئەلکسیڤیچ میاگۆڤ) مامووریەتی تایبەتی (K.G.B) لە ساڵی ١٩٦٩ ی زایینییەوە تا ساڵی ١٩٧٣، لە ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات بووە . ئەم ماوەیە ڕێکەوت بوو لەگەڵ بارودۆخێک کەوا بیردەکرایەوە لاپەڕەیەکی تازە بکرێتەوە لە دۆستایەتی و پەیوەندی لە نێوان ئەڵمانیای فیدڕاڵ و ڕووسیا . لەو ساڵانەدا ڕای گشتی ناوەندە کۆمەڵایەتییەکانی جیهانی وابوو پەیوەندی نێوان ڕووسیا و ئەڵمانیای فیدڕاڵ کارێکی ئیجابی دەبێت لەسەر ئاستی ئەوروپا و هەروەهاش کاردەکاتە سەر پەیوەندی نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا.

لە ساڵی ١٩٦٩ دا ڕێککەوتنێک لە بەینی ڕێبەرانی ئەڵمانیای فیدڕاڵ و یەکێتیی سۆڤیەت مۆرکرا و بە پێی ئەم ڕێککەوتنە (پەنا بردنە بەر زۆری) لە بەینی هەردوو وولات وەلا دەنرێ و هەروەها ئەمە بەڵێن نامەیەکیش بوو وەک سەرەتایەک بۆ چالاکییە هاوکارییەکانی ئاشتبوونەوە . ئەم ڕێککەوتنەش لەلایەن (ئەندرێ گرۆمیکۆ) ی وەزیری کاروباری دەرەوەی ڕووسیا و (ئیگۆن بار Egon Bahr) - ی وەزیری کاروباری دەرەوەی ئەڵمانیا مۆرکرا.

لە میانەی گفتوگۆکانی تری بەینی هەردوو وولات خاڵی سەرەکی لەو گفتوگۆیانەدا داکۆکی دەکردە سەر کەمکردنەوەی گرژی نێوان ئەڵمانیای ڕۆژئاوا و ڕووسیا دروست کردنی بڕوا بە یەکبوونی دوولایەنە . لە ڕوانگەی دیبلۆماسییەوە هەموو شت بە باشی دەچووە پێش و ئاسۆی هاوکاری ئاشتیانەی نوێ لە بەینی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا

دەبینرا . کەچی لە هەمان کات و ڕێکەوت لەگەڵ هەمان هەوڵە دیبلۆماسییەکان (ئەندرۆپۆف Andropouf) – ی سەرۆکی ئێستای یەکێتیی سۆڤیەت و سەرۆکی ئەوسای (K.G.B) لە بڕیاری ژمارە ٣٩ ی ٢٨ی نیسانی ساڵی ١٩٧٠ دا بە داکۆکی کردن لەسەر نهێنییەتی ئەم بەڵگەنامەیە لە (بەڕێوەبەرایەتی بەشی ئەورووپای ڕۆژئاوای) ئەم دەزگایە داوای کردوە کە:-

- هەوڵی زیاتر بدرێت بۆ پەیداکردنی سیخوڕ لە هاوولاتیانی ئەڵمانیای ڕۆژئاوا.

- لەسەر خاکی ئەڵمانیای ڕۆژئاوا چالاکی بەدەست هێنانی زانیاری و دەنگ و باس فراوانتر بکرێت.

ئەم بەڵگەنامە زۆر نهێنییە بە ئیمزای سەرۆکی ئەو کاتی (K.G.B) ئەندرۆپۆف کاتێ دەرچووە کە ڕێبەرانی کرملین لە بەستنی پەیمانی (مۆسکۆ) و (بۆن) دڵنیابوون . هەروەها مۆسکۆ ئاگاداری نیەت پاکی ئەڵمانیای فیدراڵ بوو و پێشبینی چاکتر بوونی پەیوەندی لەگەڵ پۆڵۆنیا و کەمکردنەوەی گرژی لە ئەوروپا دەکرد . کەچی (مەکتەبی سیاسی) و (K.G.B)هەوڵیان دەدا ئەم بارودۆخانە کاتی نیشان بدەن و لە خەیاڵی مەبەستە درێژخایەنەکانی سۆڤیەت دابوون و لە هەوڵی ئەوەدابوون لەم هەلومەرجەی ئێستادا زۆرترین سەرکەوتن بەدەست بهێنن.

بەڵێن نامەیەک (پەیمانێک) لە نێوان یەکێتیی سۆڤیەت و ئەڵمانیای فیدراڵ ئیمزا کرا کە تیایدا (پەنا بردنە بەر زۆری) بە تاوان و وەلای دەنا کەوا بیر دەکرایەوە سەرەتایەک بێت بۆ هاوکارییەکان لەپێناو ئاشتیدا و لە هەمان کاتیشدا دەوڵەتی ئەڵمانیای ڕۆژئاوا بە مەبەستی باشترکردنی پەیوەندی لەگەڵ (پۆڵۆنیا) کەوتنە گفتوگۆکردن و لە ئەنجامدا پەیمانێکی لەگەڵ ڕێبەرانی (وارشۆ) ئیمزا کردو کێشە سنوورییەکانی ئەم دوو وولاتە کۆتایی پێهات و (Oder – Neisse) بە

خەتی سنووری ڕۆژئاوای ئەم وولاتە ناسێندرا . هەروەها بەپێی بەندەکانی ئەم پەیمانە بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکییەکانی ئەم دوو وولاتە (پەنا بردنە بەر زۆری) بە تاوان دادەنرێت.

ناوەندە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی جیهان بە ووردبوونەوە لەو کارو کاردانەوە سیاسییانەی لە پەیوەندی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا و ئیمزاکردنی ئەم جۆرە ڕێککەوتننامانە پێشبینیان دەکرد کە لە پەیوەندی ئەم دوو بەرەیەدا لە داهاتوویەکی نزیک دا، گۆڕانکارییەکی سەرەکی ڕوویدەن و زەمانی ئاشتبوونەوە و نەمانی گرژی دابێت . بەڵام لە ڕوانگەی (K.G.B) کەم بوونەوەی گرژی بەمانای زیاترکردنی چالاکی ئەم دەزگایە بوو لە ئەوڕوپا، ماموورەکانی، لێپرسراویەتی تریان وەردەگرت . بەڕێوەبەرایەتی ناوەندی (K.G.B) لە مۆسکۆ لە بەشی ئەوروپای داوادەکرد کە کەڵکی تەواو لە هەل و مەرجەی هاتۆتە کایەوە وەربگرن.

لە کۆتایی ساڵی ۱۹۷۲ ی زایینی ئەنجامی گفتوگۆی نێوان هەردوو ئەڵمانیای بە مۆرکردنی ڕێککەوتننامەیەک کۆتایی هات و سەرکەوتنێکی تازە هاتە دەست هاوولاتیانی ئەڵمانیای ڕۆژئاوا بۆ سەردانی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات . ئەم بابەتە سەرنجی زۆری بەڕێوەبەرایەتی (K.G.B) ڕاکێشا بەشێوەیەک کە لە بەرواری ۸ی ئایاری ساڵی ۱۹۷۳ دا بەنامەی ژمارە ٤۲ فەرمانیدا بە ماموورەکانی کە لەم هەل و مەرجەی کە لە ئەنجامی سەفەرکردنی خەڵکێکی زۆرتر لە هاوولاتیانی ئەڵمانیای فیدڕاڵ بۆ ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات هاتۆتە پێش ئەوپەڕی کەڵک وەربگرن بۆ پەیداکردنی هاوکارو سەرچاوە خەبەرییەکان لەم خەڵکانە و چالاکییەکانی خۆیان لە هەموو ڕوویەکەوە فراوانتر بکەن . بە ڕاسپاردەی (زۆر نهێنی) یەوە، ئەم فەرمانە لەلایەن (مەکتەبی سیاسی و ڕێبەرایەتی و دەوڵەتی ڕووسیا) داکۆکی لەسەر دەکرا.

ئەم ڕاستیە ئەوە نیشان دەدات کە ڕووسیا هەرگیز بەدوای کەمکردنەوەی گرژی و هەنگاونان بەرەو ڕێبازی ئاشت بوونەوە نەبووە و بەڵکو هەر جارەی ئیمتیازێکی دابێتە جیهانی ئازاد هەوڵی داوە سوودی سیاسی پێویست وەربگرێ.

## ئەرکەکانی (K.G.B) لە ناوەوەی وڵاتدا

ماموورانی (K.G.B) لەناو خاکی یەکێتیی سۆڤیەت دا وەک پۆلیسی سیاسی بۆ بەربەرەکانی کردنی نەتەوەییەکان و دژە سۆڤیتییەکان کاردەکەن و خاوەن دەسەلاتێکی زۆرن کە بە بەکارهێنانی دەتوانن هەموو یاساکان و لەوانەش دەستووری سەرەکی وولات بە بەهرە وەرگرتن لە ڕەوتی ستالینیستی بخەنە ژێر پێوە.

لە بەڵگەنامەیەکی زۆر نهێنیدا لەژێر سەردێڕی (یاسای کۆمیتەی پەیوەندیدار بە ئۆرگانی ئاسایشی نەتەوەیی) کە سەر بە ئەنجومەنی وەزیرانی یەکێتیی سۆڤیەتە هاتووە:-

(ماموورانی (K.G.B) بۆ ئەنجامدانی ئەرکەکانی سەرشانیان دەتوانن کەڵک لە دەسەڵاتە گشتییەکان و تایبەتییەکان وەربگرن. )

ئۆرگانەکانی (K.G.B) بە پێی فەرمانی بڕیار لەسەر دراوی سەرەوە خاوەنی ئەم دەسەلاتانەی خوارەوەن:-

ئامادە و دابین کردنی سەرچاوە خەبەرییەکان بەبێ هیچ جۆرە سڵ کردنەوەیەک . دامەزراندنی تۆڕی خەبەری لە مامووران و سەرچاوە خەبەرییەکان و دابین کردنی ئاسایشی ئەم تۆڕانە . ئەنجامدانی چالاکی بە دزی گوێدانە تەلەفۆن و دەزگا پەیوەندییە گشتییەکان . بەنهێنی وێنەگرتن و چوونە هەر جێگایەک کە گومانی ئەوەی لێ بکرێت، لەوێدا لە پشت پەردەوە بڕیاری وا بدرێت کە دژی سەروەری یەکێتیی سۆڤیەت بێت.

- دامەزراندنی کۆمیتەکانی بەدواداچوون و چاودێری و دابین کردنی ئاسایشی بەڕێوەبەرایەتییەکان و دام و دەزگاکانی یەکێتیی سۆڤیەت و ئاگاداری و چاودێریکردن لەسەر تۆڕی کاربەدەستانی (K.G.B)لە بەڕێوەبەرایەتیەکان و دام و دەزگاکانی تری ناو وولات.

- ئامادە بوون بۆ پێشهاتە تایبەتییەکان بۆ ڕێگە گرتن لە ڕوودانی هەر جۆرە چالاکییەکی دوژمنکارانە لەسەرتاسەری خاکی یەکێتیی سۆڤیەت و لە دەرەوەی وولات بۆ پارێزگاری کردن لە هاوولاتیان و بەرژەوەندی یەکێتیی سۆڤیەت.

بەنهێنییەوە چاودێری کردن لەسەر هەموو پەیوەندی و گواستنەوەی پۆستی و تەلەفۆنییەکان لە ناوەوە و دەرەوەی وولاتدا لە پۆست کارتێکی پیرۆزبایی بەبۆنەی سەری ساڵی نوێوەوە بگرە تا تەلەفۆن کردنێکی سادە بۆ دۆستێک.

کەڵک وەرگرتن لە ڕۆژنامە و بڵاوکراوەکان بۆ گوڕینەوەی فەرمان و بانگەوازە نهێنییەکان.

- بەووردی چاودێری لەسەر کەسانێک بکەن کە پێشتر لە زیندان بوون و پاش تەواوبوونی ماوەی زیندانیان ئازاد کراون.

دابین کردنی چاودێری کردن لەسەر پەیوەندییە تەلەفۆنییەکانی ئەو ئۆرگانانەی وولات کە پەیوەندی گرنگیان لەگەڵ دەرەوە و ناوەوەی وولاتدا هەیە . ئەم کارەش نووسراوی کارگێڕی بەڕێوەبەرایەتیەکانیش دەگرێتەوە.

- (K.G.B)کە گومانی کەوتە سەر کەسێک بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی دەتوانێ گومان لێکراوەکان زیندانی بکا وە یا بیانخاتە ژێر چاودێری و بەدواداچوون (تعقیب) ی ووردەوە.

ماموورەکانی گومرگی فرۆکەخانەکان و خاڵە سنوورییەکانی وولات لەلایەن (K.G.B) دادەمەزرێندرێن بۆ ئەوەی لە پشکنینی بەڵگەنامەی بیانییەکان و هاوولاتیانی ڕووسی کە دەچنە دەرەوە لە چوونە دەرەوەی هەر شتێک کە زیانی هەبێت بۆ بەرژەوەندی وولات یا هاتنە ناوەوەی شتومەک و بڵاوکراوە و بەڵگەنامە ڕێگا پێنەدراوەکان بۆ ناوەوەی وولات ڕێگا بگرن.

هەموو ئەو بیانییانەی سەردانی ڕووسیا دەکەن لە چرکەی هاتنە ناوەوەی وولاتدا بە ووردی دەخرێنە ژێر چاودێری ماموورانی (K.G.B)بۆ ئەوەی سەردانی هەموو شوێنەک نەکەن کە ڕێگایان پێنەدرێت و هەروەهاش تا ڕێگە لە چالاکییە سیخوڕییەکانیان بگرن و لە دوای تەواوبوونی مۆڵەتی سەردانیان خاکی ڕووسیا بەجێ بهێڵن . هەروەها ئەو بیانییانەی نیشتەجێی ڕووسیان لە کارگەرێکی کۆمپانیاکانی بارکردن و گواستنەوەی ڕووسییەوە بگرە تا قوتابییەکی بیانی کە لە زانکۆی (پاتریس لوموبا) ی مۆسکۆ دایە لەژێر چاودێری ووردی (K.G.B) دان.

(K.G.B)لە سیستەمی بەڕێوەبەرایەتی ناوخۆی ڕووسیا، کە یەکێکە لە ئۆرگانەکانی وولات ئەم دەسەلاتانەی خوارەوەی هەیە:-

- دەرکردنی یاسای بە زۆر جێبەجێکردنی (إجباری) و بە ووردی چاودێری کردنە سەر جێبەجێکردنیان.

ڕێگە گرتن لە کەسانی ئاسایی لە بەدەسکەوتنی بەڵگەنامە ڕێکخراوەکان (منقم. (

لێکۆڵینەوە لە داواکاری هاتنی ئەو بیانییانەی کە مەبەستیانە سەفەر بۆ ڕووسیا بکەن . وەرگرتن یا وەلانانی داواکارییەکان.

بڕیاردان لەسەر پووچەڵکردنەوەی هاووڵاتیەتی ڕووسی وە یا بەخشینی ئەم مافە بە بیانییەکان.

بەم شێوەیە ئەم بەڵگەنامانە نیشانی دەدەن کە هیچ کەسێک لە چوارچێوەی چالاکییەکانی (K.G.B) بەدەر نییە و هەموو هاولاتییەکی ڕووسی هەر لە سەرەتای لەدایک بوونییەوە لەناوەندی منداڵ بووندا (مستشفی الولادە) دەخرێنە ژێر چاودێرییەوەو لەکاتی مردنیشیدا بەشداری ڕێوڕەسمی بە خاک سپاردنی دەکرێت.

)مەکتەبی سیاسی) و (دەوڵەتی ڕووسیا) زیاتر لە یاسا مرۆڤایەتی و نێونەتەوەییەکان و بڵاوکراوەی سەربەستی مافی مرۆڤ دەسەلاتی داوتە ئەم ئۆرگانە بۆ نموونە (یاسای کۆمیتەی ئاسایشی نەتەوەیی سەر بە ئەنجوومەنی وەزیرانی یەکێتیی سۆڤیەت) بە ڕاشکاوییەوە دەری بڕی :- ماموورانی (K.G.B) دەسەلاتیان هەیە چاودێری لەسەر هەموو پەیوەندییەکانی گواستنەوە و گەیاندن و پۆست و تەلەگراف و تەلەفۆن و بە دزی گوێدانە گفتوگۆ تەلەفۆنییەکانی هاووڵاتیان و سانسۆرکردنیان (لە کاتێک دا یاسای سەرەکی ڕووسیا داکۆکی دەکاتە سەر ئەوەی کە بەدزییەوە گوێدانە تەلەفۆن و سانسۆرکردنی ئەمانە ڕێگای پێنادرێت) . بۆ ئەنجامدانی ئەم کارانەش بەڕێوەبەرایەتی (P.K) کە کورت کراوەی ڕستەی ڕووسی (سانسۆری نهێنی نووسراوەکان)ە لەژێر چاودێری بەڕێوەبەرایەتی (O.T.U) کە یەکێکە لە بەشە تەکنیکییەکانی (K.G.B) دامەزراوە لە سەرتاسەری وولات بڵاوکراوەتەوە . کارمەندانی ئەم یەکەیە لە ناوەندە پێویستییەکان بە ناوی کارمەندی پۆستی کاردەکەن و ئەمانە لە ژووری تایبەتدا لەم شوێنانە بە کۆمەڵێک دەزگای ئاڵۆزو پێشکەوتووی هونەری و زانستی هەموو پەیوەندییە پۆستییەکان دەخەنە ژێر چاودێرییەوە.

لە ڕێنماییەکی زۆر نهێنی دا لەژێر سەردێری : بنەمای چالاکییە دژە سیخوڕییەکانی ئۆرگانەکانی (K.G.B) بە ئیمزای (بانیکۆف – Banikov)هاتووە:-

ئاگاداربن ! هەموو بەندە پۆستی و نامە و تەلەگرافی ئەو کەسانە وەلابنرێن کە ناویان لە لیستی (K.G.B) دا هەیە.

نووسراوە گومان لێکراوەکان کە پەیوەندی لەگەڵ دەزگا سیخوڕییە بیانییەکان تاوانبارانی ناوخۆیی و نووسەرانی هەڵگەڕاوەو دژە ڕووسیا دەکەن لە ڕێگای بەراوردکردن لەگەڵ نووسینە خەتییەکان و ئەزموونی تر بناسرێن و دەست نیشان بکرێن.

بۆ هەموو ئەو کەسانەی بەهەر شێوەیەک پەیوەندی نووسین لەگەڵ وولاتە سەرمایەدارەکان دەکەن دۆسیەیان بۆ بکەنەوە.

نامە و ناردراوە پۆستییەکان کە لە نووسینە نادیارو تواناکانی تری نادیاری هونەری بۆ گەیاندنی پەیام بە دەرەوە کەڵک وەردەگرن بخرێنە ژێر چاودێرییەوە.

نامەی ناردراوی کەسانێک کە لە (چوارچێوەی بەرنامەی ئاسایش) دەژین و کارو چالاکی دەنوێنن بە ووردی بخرێنە ژێر چاودێرییەوە.

پێویستە لەسەر مامووری (K.G.B) لەکاتی بەتاڵکردنی سندوقە پێویستییەکان و تەسلیم کردنی بەڵگەنامە و دانانی عنوانی ئەو نامانەی کە ژمارەی پۆستیان هەیە چاودێریش بکەن . ئەم فەرمانە تەلەگراف و (تلێکس) یش دەگرێتەوە.

· ئەو نامانەی عنوانی نێرەریان لەسەر نیە و تەنیا عنوانی وەرگریان لەسەرە وەلابنرین و هەرگیز نەدرێن بە خاوەنەکانیان.

بۆ چاودێری کردنی نهێنی کەسانێک کە مەبەستە و لەژێر چاودێری دان هاوولاتی ڕووسی بێت یان بیانی و (K.G.B) مەبەستی بێت ئۆرگانێکی تایبەت بە ناوی (N.N) دامەزراوە کە دەسەلاتی هەیە هەرکەسێ بێ و لەهەر جێگایەک بێت بە دوای دابچن و بیخەنە ژێر چاودێرییەوە . فەرمانبەرەکانی (N.N) لە سەفەری شاندەکە سیاسی، کۆمەلایەتی، زانستی، فەرهەنگی، وەرزشی، هونەری و . هتد، ڕووسی بۆ دەرەوەی وولات بەشداری دەکەن تا لە پەیوەندی ئەمانە لەگەڵ بیانییەکان و ئەگەری هەلاتنیان پێشگیری بکەن . ئەندامانی ئەم ئۆرگانە تایبەتە تەنانەت لەگەڵ ڕێبەرانی ڕووسی بۆ دەرەوەی وولات هاوڕێیەتی دەکەن و چاودێری لەسەر پەیوەندی ڕێبەرەکانیان و لە گفتوگۆ نهێنییەکان لەگەڵ ڕێبەرانی بیانی بەشداری دەکەن.

بەشێک لە ئەرکەکانی ئەم ئۆرگانە چاودێرە تایبەتە (N.N) بە دواداچوون و چاودێریکردنی ئەم کەسانەیە کە لە ڕوانگەی (K.G.B) یەوە مەترسییان هەیە بۆ وولات . ئەمەش کەسانێک دەگرێتەوە کە بەهۆی (تاوانباربوونی بە دژە وولات) ماوەیەک لە زیندان بووە . ئەم تاوانانەش لەوانەیە بریتی بن لە قسە ووتن یان ڕەخنەگرتن لە سیستەمی فەرمانڕەوای وولات یان پڕوپاگەندە کردن دژی ڕووسیا یان بابەتی تری قورستر بێت (K.G.B) . ئەرکی چاودێری و بەدواداچوونی هەمیشەیی ئەم جۆرە کەسانەی بە ئۆرگانی چالاکی تایبەت (N.N) سپاردووە.

نووسراوی ژمارە ٨٠ ی ساڵی ١٩٦٥ ی زایینی بە ئیمزای سەرۆکی (K.G.B) ئەم خالە دەگرێتە خۆو دەڵێت.

چالاکی چاودێریکردن بریتی یە لە :- (بە نهێنی کەسانێک خستنە ژێر چاودێرییەوە کە لە ڕابردوودا تاوانیان دژی وولات ئەنجام داوە و زیندانی کراون یان ئەو گروپە لە هاوولاتیانی ڕووسی

دەگرێتەوە کە ئەگەری ئەوەیان لێ دەکرێت ڕۆژێ لە ڕۆژان هەڵوێستێک بنوێنن کە دژی بەرژەوەندییەکانی وولات بێت) . بۆ نموونە دەبێ بڵێین ئەم کەسانەی خوارەوە بەشێوەیەکی هەمیشەیی دەخرێنە ژێر چاودێری و بەدواداچوونی تا کۆتایی ژیانیان:-

مامووران و ئەو کارمەندانەی کە ماوەیەک بۆ ئەنجامدانی ئەرکیان چوونەتە وولاتە سەرمایەدارەکان . (کارمەندانی سیاسی، ئابووری و کەسانیک کە بە هەر مەبەستێک تا ئێستا سەفەریان بۆ وولاتە سەرمایەدارەکان کردبێت. )

ئەو کەسانەی بە ئاشکرا خاوەنی بیروڕای دژە سۆڤیەتن، بەلام لەبەر بیروڕای گشتی جیهان دەوڵەتی ڕووسیا ناتوانێ بیانگرێت، وەک زانایان کە لەسەر ئاستی نێونەتەوەیی ناسراون وە یا ئەو نووسەرانەی کە لە جیهاندا ڕێزیان دەگیرێ.

ئەو پەنابەرانەی کە لە وولاتە سەرمایەدارییەکانەوە هاتوون بۆ یەکێتیی سۆڤیەت و ئێستا لەم وولاتەدا نیشتەجێ بوونە.

لێپرسراوانی پێشووی دەوڵەت و ئەندامانی مەکتەبی سیاسی حزب و کاربەدەستی پۆستەکانی تری حزبی و دەوڵەتی کە ئێستا لەسەر کارنین.

سەرۆک و ئەندامانی کاریگەری ئۆرگانە مەزهەبی و ئەو ڕێکخراوانە کە خاوەنی بیروڕای دژی مارکسیزمن.

لایەنگرانی پێشووی ترۆتسکی و ئەو مارکسیزمانەی کە لەلایەن دەوڵەتی ئێستای ڕووسیا بە هەڵگەڕاوە و تاوانبار دەناسرێن.

ئەم دەستوورنامەیە بەم پەرەگرافە کۆتایی دێت :- (مەبەست لەم جۆرە چاودێرییە نهێنییانە بۆ پووچەڵکردنەوەی هەر جۆرە ئەگەری هەوڵ و

کۆششێک کە لەوانەیە لەلایەن ئەم کەسانەوە دژی بەرژەوەندییەکانی یەکێتیی سۆڤیەت ئەنجام بدرێت.

ئەمە جگە لەوەی (K.G.B) بەناوی ئەوەی گوایا دژی دوژمنانی سۆشیالیزم لە ناوەوەی وولاتدا کاردەکات، هەوڵ و کۆششێکی بەربڵاو فراوان دەکات تا ترس بخەنە ناو دڵی خەڵکەوە بۆ ئەوەی بە زۆری بیانخەنە ژێر باری خواستی گوێ ڕایەڵی . یەکێک لە ڕێگاکانی (K.G.B) بۆ پیادەکردنی ئەم مەبەستانە بەکاربردنی ڕەواڵی ناسراو بە (ڕێگەگرتن) ە.

# بۆریس ئیڤانۆف و(K.G.B)

(بۆریس ئیڤانۆف) لە یەکێک لە زانکۆکانی ڕووسیا لە بەشی (ئەدەبیاتی بیانی) لە خوێندنی باڵا دەرسی دەخوێند . لە یەکێک لە وانەکاندا لە زانکۆ لە بەینی مامۆستا و قوتابییەکانی بابەتێک گفتوگۆی لەسەر دەکرێ و ناوبراو بیروڕای خۆی دەردەبڕێ و دەڵێت:-

)هەموو شت لە وولاتانی کاپیتالیست خراپ نیە و لە جیهانی سەرمایەداری خاڵی باش و ئیجابیش دەبینرێ(.

بەشێوەیەکی ئاسایی لەم پۆلەی دەرس خوێندندا قوتابی هەن کە پەیوەندییان لەگەڵ (K.G.B) دا هەیە و ئەرکی گواستنەوەی دەنگوباسیان لە ئەستۆ دایە . هاوکارەکان ئەو خەبەرە و بۆچوونەی (ئیڤانۆف) دەگەیەننە لێپرسراوانی. (K.G.B)

)ئیڤانۆف) لە ئەرشیفەکانی (K.G.B) ڕابردووی خراپی نییە و دوژمن دژە سۆشیالیست و تاوانبار نیە و قوتابیەکی زانکۆیە و تەنها بیروڕایەکی دەربڕیوە . ئەگەرچی ئەو تا ئێستا ڕەخنەی لە فەرمانڕەوایەتی یەکێتیی سۆڤیەت نەگرتووە، بەڵام لێکۆڵەرەوە زانیارییەکانی (K.G.B) بە وەرگرتنی ئەم هەواڵە و ئاگاداربوون لەسەر بیروڕای (ئیڤانۆف) لە چوارچێوەی زانکۆدا وای بۆ دەچن ئەگەر کەسانێک هەبن بەم بیروبۆچوونەوە لەوانەیە ئەگەر لە داهاتوویەکی دووریش بێت ئەگەری کەسێکی دژە ڕووسی لێدەکرێ . بێجگە لەمەش لەوانەیە قوتابییەکی وا لە چوارچێوەی خوێندنی زانکۆدا کار بکاتە سەر قوتابیانی تریش . بۆیە بە دوای کارەکەی دەکەون و لە ڕۆژی خۆی دا لێپرسراوانی زانکۆ بانگی (ئیڤانۆف) دەکەن بۆ گفت و گۆ کردن لەسەر ئەم بابەتە لە کۆبوونەوەیەکی تایبەت دا . لەم کۆبوونەوەیەدا دوای

گفتوگۆیەکی زۆر (ئیڤانۆف) دێتە سەر ئەو بڕوایەی کە بیروڕای ئەو هەڵەیەکی گەورە بووە کە هەیبووە و لە جیهانی سەرمایەداری دا بچووکترین خاڵی ئیجابی نابینرێ و بەڵێم دەدات جارێکیتر هەرگیز تووشی هەڵەی وا نەبێتەوە . دوای ئەمەش لێپرسراوی گەورەی (K.G.B)لە زانکۆ (ئیڤانۆف) ڕادەسپێرێ کە لە کۆبوونەوەیەکی (کۆمسۆمۆڵ، واتە یەکێتیی لاوانی حزبی کۆمۆنیستی یەکێتیی سۆڤیەت) دەبێ ئامادە بێت و لەبەرامبەر هەموو قوتابیان و هاوپۆلەکانی دان بە هەڵەکانی دابنێ.

)ئیڤانۆف) کە خۆی دەزانێ سەرپێچی کردن لەم فەرمانە چ دواڕۆژێکی بە دواوەیە، بۆیە هەموو فەرمانەکان بەجێ دەگەیەنێ و لە کۆبوونەوەی (کۆمسۆمۆل) لە کاتێکدا لە پشت میکرۆفۆنەوە هاواردەکا و بە مست لە مێزەکە دەدا بۆ قوتابییەکان باسی زیانەکانی جیهانی سەرمایەداری دەکا و داوای لێبوردن لە هەموو هاوپۆلەکان دەکات لەوەی کە لە ڕابردوودا بۆ ماوەیەکی زۆر کەم تووشی هەڵە ببوو و بیری بۆ هەبوونی خاڵی ئیجابی لە جیهانی سەرمایەداری دا چووە . چەند قوتابییەکی تریش لەم کۆبوونەوەیەدا قسە دەکەن و داکۆکی دەکەنە سەر بێ ئاگابوونی هاوڕێ کەیان لەوەی کە لە ڕابردوودا بە باشی بیری لە خراپی جیهانی سەرمایەداری نەکردۆتەوە و هەموویان خۆشحاڵی خۆیان دەردەبڕن بەوەی کە هاوڕێ قوتابییەکەیان هەستی بە هەڵەکەی کردووە و ئێستا بەتەواوی ئاگادارە لەسەری.

هەموو قوتابییەکان دەزانن کە هەڵسوڕێنەری ئەم شانۆگەرییە (K.G.B)یە و لەگەڵ ئەوەشدا هەموویان بە خواست و ئارەزووی خۆیان دەبنە هاوکاری (K.G.B) بۆ ئەنجامدانی شانۆگەرییەکی وا، چونکە دووچاری ترس و دڵەڕاوکێ بوونە لەم ئۆرگانە . یانی هەمان ئەم مەبەستەی (K.G.B) مەبەستیەتی.

# ڕەواڵی ڕێگەگرتن

بە پێی دەستووری ژمارە (٢٢٥) ی ساڵی ١٩٥٩ و دەستووری ژمارە (١١٧) ی ساڵی ١٩٦٤ بە ئیمزای سەرۆکەکانی ئەو کاتی (K.G.B) ڕەواڵی (ڕێگەگرتن) لەم کاتانەی خوارەوەدا بەکاردەهێنرێ:-

- پەیوەندی لەگەڵ بیانییەکان بۆ مەبەستە زۆر تایبەتییەکان یان بە شێوەیەکی گشتی لەوانەیە ببێتە هۆی کەڵک وەرگرتنی پێچەوانەی دەزگا زانیارییەکانی دوژمن.

بڵاوکردنەوەی دەنگوباس دەربارەی چالاکیی کەسی یان ئەو کارە ڕێکخراوانەی بەڕێوەبەرایەتیەکان (اعمال إداریە منظمە) کە نابێت هەموو کەس ئاگاداری لەسەریان هەبێت، (هەروەهاش ئەو سەردێرانەی پەیوەندی بە نهێنی شارستانی یان نیزامییەوە هەبێت).

ئەندامیەتی لەو ناوەند و گروپانەی کە چالاکییان بە پێی یاسا ڕێگای پێنادرێت.

تەفسیر و دەربڕینی بە هەڵە دەربارەی سیاسەتەکانی دەوڵەت و حزبی کۆمۆنیستی ڕووسیا، تەنانەت ئەگەر ئەو کەسەش لە ڕوانگەی گشتی دژە سۆشیالیزم و دژی سۆڤیەتیش نەبووبێ و تەفسیر و دەربڕینەکەشی دوژمنانە نەبووبێ.

هەر جۆرە پێدا هەڵاگوتن و ستایش و لایەنگری کردنی بۆرجوازیەت.

بەشێوەیەکی گشتی لە دەفتەرچەی ڕاسپاردەکانی تایبەتی ئەندامانی (K.G.B)بەو چالاکیانەی پێشگیری لە هەرجۆرە کارێک کە پێچەوانەی

بەرژەوەندی نەتەوەیی سۆڤیەت و حزبی کۆمۆنیست بێت دەووترێ (یاساکانی ڕێگەگرتن) . هەر کاتێ ئەم یاسایانە هاوولاتییەکی ڕووسی بگرێتەوە بەلایەنی کەمەوە بۆ ماوەی ساڵێکی تەواو دەخرێنە ژێر چاودێری تەواوی نهێنییانەی (K.G.B) . ئەگەر ئەو کەسەش جارێکی تر تووشی هەمان هەڵەی پێشووی ببێتەوە بە تاوانبار لە قەڵەم دەدرێ و لەم حاڵەتەدا بەلایەنی کەم بۆ ماوەی دووساڵ زیندانی دەکرێت و سەرباری ئەمەش ناوو کەسایەتی و ڕابردووی ئەو کەسە لە ئەرشیفی (کۆمیتەی ئاسایشی نەتەوەیی) بەناوی کەسێکی گومان لێکراو کە جێگا متمانە پێکردن نەبێت لە بواری سیاسی و نەتەوەییەوە تۆماردەکرێ کە بە دڵنیاییەوە تا دوا هەناسەی ژیانی لە هەموو ئیمتیازێکی ژیان لە کۆمەڵگاکەی دا بێ بەش دەکرێت.

لە ناوەوەی وولاتدا هاوکارەکانی (معتمد) ی (K.G.B) لە هەموو شوێنەک دا بلاوبوونەتەوە . مەتەڵێکی ڕووسی هەیە دەڵێ :- لە هەردوو چاوی ڕووسییەک، چاوێک ماموری چاوەکەی تریەتی.

. هاوکارەکانی (K.G.B) کە ڕووسەکان بە (شپیک Shpik) – ناویان دەبەن زۆربەی ئەو زانیارییانەی (K.G.B) مەبەستیەتی لە ناوەوەی وولات بەدەست دێنن . ڕووسیا پڕیەتی لەو هاوکارانە . ئەو ماموورانە لە هەموو چین و توێژەکانی کۆمەڵگا هەڵدەبژێردرێ و دەخرێنە کارکردنەوە . لەناو کارگەرەکانی کێڵگە سۆشیالیستییەکان (کالخوزەکان) و کارگەرەکانی کارگەکان و لە بەینی قوتابیان و مامۆستایان و سەربازان و کارمەندانی بەڕێوەبەرایەتییەکان و . هتد هەڵدەبژێردرێن.

لە ڕاستیدا سەرجەم ڕووبەری یەکێتیی سۆڤیەت بریتیی یە لە تۆڕێکی فراوانی ماموورانی (K.G.B) و هەر لەبەر ئەمەیشە ڕووحیەتێکی پاڵپشت بە هەستی بڕوایی نەبوون و ئاوێتە بوو لەگەل

ترس و دڵەڕاوکێ، فەرمانڕەوایە لەسەر کۆمەڵ دا . هەر کەس ئەویتر بە (شپیک) ناو دەبا و لە زۆر بواردا خەڵک تەنانەت بڕوای بە دۆست و خزمانی خۆیشی ناکات.

لە مێژووی ئێستای ڕووسیادا جگە لە یەک دووجار نەبێت ئەویش لەلایەن (ئەندرێ ساخارۆف و ئەلکسەندەر سولژنیتسن و ئەندرێ ئەمالریک) ەوە کەسی تر نەبینراوە بوێرێ و شەهامەتی ڕەخنە و دەربڕینی بیروڕای خۆی هەبێت (K.G.B) . تەنانەت لەگەڵ ئەم جۆرە کەسایەتیە ناسراوانەش کە ڕێزی نەتەوەییان هەیە لێبووردنی نییە و زۆربەی ئەم پیاوە ئازایانە پاش گرتنیان ڕەوانەی جەزیرەکانی (گولاک) یا ئۆردوگاکانی کاری بە زۆری (اجباری) لە سیبریا دەکرێن و زۆربەشیان ژیان لە نەخۆشخانە ڕەوانییەکان دەبەنە سەر . ئازاردان و زیندانیکردن و دوورخستنەوەی کەسایەتی ناسراوەکانی وەک (ساخارۆف، سولژنیتسن، ئەمالریک) لەسەر دەربڕینی بیروڕایان بووەتە هۆی نارەزایی دەربڕینی ناوەندە کۆمەلایەتییەکانی جیهان . بەلاَم لەلایەکی ترەوە دەیان کەس کە ناسراونین و کەس نایانناسێ لەژێر دەستی دەزگاکانی شکەنجەی (K.G.B) لە ئۆردوگا و زیندانەکانی شوێنە دوورەکانی وولاتی پان و بەرینی یەکێتیی سۆڤیەت وورد و خاش دەکرێن و کەسیش هیچ لە چارەنووسیان نازانێ.

## جەنەڕاڵ گریگورنکۆ و (K.G.B)

لە زۆر بواردا (K.G.B) بەزەیی بە بەرزترین لێپرسراوانی وڵاتیش ناکات . زۆر ڕاستی لەم بارەیەوە هەن ئاشکرا نەبوونە و بڕواش ناکرێت قەت ئاشکرابن، چونکە ئەم دەزگایە بە ئەوپەڕی ووردبینی و چاودێرییەوە ئەم نهێنییانەش تەنانەت لە مامووڕانی (K.G.B)ش دەشارێتەوە. یەکێک لەو کەسانەی نهێنی شکەنجەکانی ئاشکرابوون (نەقیب تراساڤیچ شلینکۆ) بوو کە خۆی ڕاستەوخۆ لێپرسراویەتی لێکۆڵینەوەی دۆسیەی (جەنەڕاڵ پیتەر گریگۆرنکۆ) ی لە ئەستۆ دابووە . ئەم جەنەڕاڵە کەسێکە کە لە ساڵی ١٩٦٤ ڕێگای بەخۆیدا ڕەخنە لە بارودۆخی فەرمانڕەوایەتی یەکێتیی سۆڤیەت بگرێت . ئەو کە زۆر جار ڕەخنەی لە ڕێبەرایەتی ڕووسیا گرتبوو لەلایەن (K.G.B) یەوە گیراو زیندانی کرا. دوای دوو ساڵ زیندانی کردن ڕەوانەی نەخۆشخانەی ڕەوانی کرا و خرایە ژێر ئەشکەنجەی ڕەوانی تایبەت . بەڵام ئازار و ئەشکەنجەدانی کاری نەکردە سەر چۆنیەتی بیرکردنەوەی جەنەڕاڵ و بەردەوام بوو لەسەر ڕەخنەگرتن لە ڕێبەرایەتی ووڵات . لە ئەنجام دا لە شوباتی ساڵی ١٩٧٠ ناردیانە نەخۆشخانەی تایبەتی شێتە مەترسییدارەکان لە (قازان) . پاش چوار ساڵ هێشتنەوەی بەزۆری (إجباری) لەم نەخۆشخانەیەدا دەورووبەرەکەی کاری تێکرد و تووشی نەخۆشی ڕەوانی بوو. بڵاوکراوەکانی جیهان زۆر بابەتیان لەسەر ئازارو ئەشکەنجەدانی (جەنەڕاڵ گریگۆرنکۆ) نووسی . ناوەندە کۆمەڵایەتییەکانی جیهان یەکێتیی سۆڤیەتیان خستە ژێر پاڵەپەستووە بۆ ئازادکردنی جەنەڕاڵی خەباتکەر . بەڵام ئەم مرۆڤە قارەمانە دوای چوار ساڵ هێشتنەوەی بەزۆری لەناو شێتانی ڕاستەقینەدا لە نەخۆشخانەی (قازان) گۆڕابوو بۆ نەخۆشێکی ڕەوانی (K.G.B) . و دەوڵەتی ڕووسیا

له حوزەیرانی ساڵی ١٩٧٤ دا لەژێر پاڵەپەستۆی گشتی جیهان (جەنەڕاڵ گریگۆرنکۆ) یان هێنایە بەردەم ڕۆژنامەنوس و پەیامنێرە جیهانییەکان تا ئەم نوێنەرانەی دەزگاکانی ڕأگەیاندن و پەیامنێری ڕۆژنامەکانی سەرتاسەری جیهان بە چاوی خۆیان ڕاستی دەربڕینەکەی دەوڵەتی ڕووسیا ببینن کە جەنەڕاڵی ناوبراو بەڕاستی نەخۆشێکی ڕەوانییە، چونکە لەم کاتەدا نەخۆشییەکەی بەتەواوی دیار و ئاشکرا بوو.

ئەفسەری لێپرسراوی لێکۆڵینەوە لە دۆسیەی جەنەڕاڵی ناوبراو نەقیبێکی زۆر کۆن و دڵڕەقی (K.G.B) بە ناوی (ئیڤان تاراساڤیچ شلینکۆ) بوو، کە لە ئەشکەنجەدەر و لێکۆڵەرە (محقق) ناسراوەکانی ئەم دەزگایەیە. (نەقیب شلینکۆ) لە ساڵەکانی ١٩٦٥ تا ١٩٧٠ یەکێک بوو لە لێپرسراوانی تایبەتی (K.G.B) لە (برنۆ Berno) – کەمنیش لەم بەشە و لەم ساڵانەدا لەوێدا خزمەتم دەکرد . جارێک لە کۆنفرانسێکی ڕاهێنانی دا (مەشق) یەکێک لە ماموورەکانی ئەم خولەی ڕاهێنان پرسیاری لە (نەقیب شلینکۆ) کرد سەبارەت بە شێتی (جەنەڕاڵ گریگۆرنکۆ) کە ئایا بەڕاستی نەخۆشێکی ڕەوانی بوو.

(نەقیب شلینکۆ) زۆر بە ڕاشکاوییەوە وەڵامی دایەوە :- نەخێر جەنەڕاڵ ناوبراو هەرگیز تووشی هیچ جۆرە نەخۆشییەکی ڕەوانی نەبیوو و تەنها گۆڕدرابوو بە کەسێکی دژە ڕووسی و سیاسەتی مەکتەبی سیاسی قبووڵ نەدەکرد و بۆیە دەبوایە تەمێ بکرێ . بەڵام نەدەکرا جەنەڕاڵێکی پایەبەرزی حزب و سوپا زیندانی و سزا بدرێ، چونکە ئەم کارە دەبووە هۆی ئابڕووچوونێکی گەورە بۆ دەوڵەت و حزب . لەم ڕوانگەیەوە هەروەها بۆ سەرنج ڕاکێشانی بیروڕای گشتی جیهان بڕیاریدا بە ڕواڵەت وەک نەخۆشێکی ڕەوانی بنێردرێتە نەخۆشخانەی ڕەوانی تا لەوێ تەمێ و سزا بدرێ.

# پیوتەر یاکیر و (K.G.B)

نموونەیەکیتری سەرنج ڕاکێش لە کردارەکانی (K.G.B) لە بابەت (پیوتەر یاکیر Pyoter Yakir) – ی قارەمانی شەڕی جیهانی دووەمە . باوکی پیوتەر لە ساڵی ١٩٣٧ لە پاکسازییە خوێناوییەکە بە فەرمانی (ژوزف ستالین) تیرە باران کرا . پاش لە سێدارەدانی ئەو تەنیا منداڵێکی تاقانەی یانی (پیوتەر) کە لە کاتی لە سێدارەدانی باوکیدا منالێکی بچووک بوو ناردیانە ئۆردوگای زۆرە ملێ کە بۆ منداڵانی ئەو کەسانەی لە سێدارە دروست کرابوو . پیوتەر ١٣ ساڵ تەمەنی خۆی لەم ئۆردوگایە بردە سەر بە تاوانی ئەوە باوکی لە سێدارە دراوە.

پاش مردنی ستالین ئابڕووی باوکی کڕایەوەو (پیوتەر) یش لە ئۆردوگای کاری بە زۆرە ملێ ئازاد کرا . (پیوتەر) کە لە ماوەی ١٣ ساڵ لەم ئۆردوگایەدا بە دڕندەترین شێوە ئازار و ئەشکەنجە درابوو و ئاشنایی تەواوی لەسەر پێشێلی مافی مرۆڤ هەبووە لەماوەی فەرمانڕەوایەتی (خرۆشچۆف) دا دەستی کرد بە خەبات کردن لە پێناوی بەدیهێنانی مافی شارستانیەتی بۆ هاووڵاتیانی ڕووسی . بۆ ئەم مەبەستەش لەگەڵ چەند کەسێکی تر لە هاوبیرانی خۆی ڕێکخراوێکی دامەزراند کە بە (N.E.S) ناسرابوو (K.G.B) . لە ساڵی ١٩٧٢ دا (پیوتەر) و هاوڕێکانی زیندانی و دادگایی کردن . پێش دادگایی کردنی ئەم دەستەیە بە دڕندەترین شێوەی شکەنجەکردنی سەدەکانی ناوەڕاست ئازار و شکەنجە دران . ئەمانە پێشتر لەو کەسانە بوون کە (حزب) و (مەکتەبی سیاسی) یان تاوانبار دەکرد بەوەی کە ئازادی کەسی و کۆمەلایەتی لە یەکێتیی سۆڤیەت لەناوبردووە کەچی ئەوەندە ئازارو ئەشکەنجە درابوون کە هەر ئەمانە لە یەکەمین دانیشتنی دادگادا خۆی بە تاوانبار دەزانی و قسەی ناشرینی بەخۆی دەووت.

چۆن کەسێک لە منالّیەوە لە ئۆردوگای زۆرەملێ بووبێ و باوکیشی لەلایەن ڕژێمەوە لە سێدارە درابێ و پاشان دەستی دابێتە خەبات کردن دژی ڕژێم و بۆ گەیشتنی بە مەبەست و ئامانجەکانی خۆی سالاّنێکی زۆر خەباتی کردبێ و قوربانی دابێ پاش گرتنی ئەو تاوانەی دەخرێتە پالّی قبولّی دەکا و خۆی بە فریوخواردوو ناودەبات ؟

پاش ئەوەی (پیوتەر) دانی بە تاوانەکانی نا ڕەوانەی زیندان کرا . بۆ ئەوەی (پیوتەر) و هاوڕێکانی بە یەکجاری بێ کەلّک بکرێن و بفەوتێندرێن لەلایەن (K.G.B) یەوە گۆڕدران بۆ مەیخۆری پیشەیی (معتاد).

سەرگوزەشتەی (پیوتەر یاکیر) نموونەیەکی باش بوو بۆ قوتابیانی قوتابخانەی سیخوڕی تا دەرس وەربگرن و فێربن کە چۆن کەسێکی دژە ڕووسی و دژە سۆشیالیزم دەتوانرێ بە چۆک دابدەن و توانای بەرگری لەودا لەبەین ببەن بە شێوەیەک خەباتکەرێک لە ماوەیەکی کەمدا پاش گرتن و زیندانی کردنی بە ئاشکرایی خۆی بە تاوانبار و گوناهبار بزانێ.

## مافیای ڕووسیا

ئەم نموونانە شێوەی ڕەفتاری نامرۆڤانەی (K.G.B) نیشان دەدات لەگەڵ مرۆڤ لە کۆتایی سەدەی بیستەمدا (K.G.B) . بچووکترین سەرنج نادات خواست و بیروڕای گشتی جیهان سەبارەت بە پاراستنی مافی مرۆڤ و خەڵک دەنێرێتە زیندان و ئۆردوگا زۆرە ملێ یەکان و نەخۆشخانە ڕەوانییەکان . بەم شێوەیە ڕەفتارکردنە ئیتر بلاوکراوەی جیهانی مافی مرۆڤ چ مانایەک دەبەخشێ ؟

لە یەک ڕستەدا دەکرێ بگووترێ یەکێتیی میللەتانی ڕووسیا (سۆڤیەت)، ولاتێکە لە ژێر فەرمانڕەوایەتی پۆلیسی نهێنی ئەم وولاتەدایە سەیرتر ئەوەیە ناوەندە گەورەکانی پروپاگەندەیی (دەزگا ڕاگەیاندنەکان) ی ڕووسی ئەم جۆرە ڕەفتارە نامرۆڤایەتیانەی بەناوی دیموکراسی بە خەڵک ڕادەگەیەنن. دەستووری سەرەکی ولات پڕیەتی لە دەستەواژە و ڕستەی هەڵخەڵەتێنراوی وەک :- (ئازادی کەسی، ئازادی ویژدان، ئازادی کار و ئازادی سەفەرکردن . هتد) . دەبێ بزانرێ کە ئەم جۆرە ڕستانە تەنها بۆ فریودانی بیروڕای گشتی جیهان نووسراون و هیچ پەیوەندییەکیان بە هاوولاتیانی ڕووسیاوە نیە . بۆ ئەمان لە جێگای ئەم دەستەواژانە (K.G.B) هەیە و دانراوە . ڕێکخراوێک کە لە سەرووی هەموو یاسا و دەستوورێکە . ژیانی هاوولاتی ڕووسی جیاوازی هەیە لەگەڵ خەڵکی تری جیهان و جیهان ئەوەندە زانیاری نیە لەسەر ئەم ڕاستییە شاراوانەی لە ناوەوەی یەکێتیی سۆڤیەت ڕوودەدەن . هاوولاتی ڕووسی هەر لەسەرەتای لەدایک بوونییەوە لەژێر بۆردومانی پروپاگەندەیی ژیان دەباتە سەر و ئەم ڕەفتارەش وایلێدەکات کەوا

تێبگات کە تاکە سیستەمێک لە جیهاندا کە ئازادی و خۆشی بۆ مرۆڤ دابین کردبێ ئەم سیستەمەی مارکسیزم و لینینیزمی سۆڤیەتە . لەگەڵ ئەمانەشدا وا دەخرێتە مێشکیەوە کە سیستەمەکانیتری جیهان، پێچەوانەی سوود و بەرژەوەندی و مەبەستە مرۆڤایەتییەکانن . مەزهەبەکان بە ناوی دواکەوتوویی و بت پەرستی و ڕێگای کەڵک وەرگرتنی کەس لە کەسی تر بە هاووڵاتیانی ڕووسی دەناسێندرێن و هەروەها بە بەردەوامی ترس دەخرێتە دڵیان لە جیهانی سەرمایەداری . هاووڵاتیەکی ڕووسی ئەوەندەی زانیاری نیە لەسەر جیهانی دەرەوە، چونکە ڕێگا وای لەبەر دەست دا نیە کە ئەم جۆرە زانیارییانە بەدەست بێنێ . ڕۆژنامە و گۆڤار و بڵاوکراوەکانی ڕۆژئاوا دەست ناکەون و لە دەزگا ڕاگەیاندنەکانی ڕووسیش تەنها پەنجە بۆ خاڵە سلبییەکان لە جیهانی ڕۆژئاوا ڕادەکێشێ وەک :- گرانی هەڵئاوسانی ئابووری، بێکاری، تاوان و وەک ئەمانە و داکۆکی دەکاتە سەر . ئەم بێ ئاگاییە لە جیهانی دەرەوە دەبێتە هۆی ئەوەی کە هاووڵاتیانی یەکێتیی سۆڤیەت نەتوانن ژیانی ڕۆژانەی خۆی و خێزانەکەی لەگەڵ خەڵکی تر جیهان بەراورد بکات و لە ئەنجامدا دێتە سەر ئەو باوەڕەی کە لە هەموو جیهاندا خۆشبەختترین کەسن.

دام و دەزگا فەرمانڕەوایەتی یەکێتیی سۆڤیەت دەتوانرێ بە هەرەمێک پێناسەی بکەین کە (ڕێبەرانی حزبی کۆمۆنیست و مەکتەبی سیاسی و دەوڵەت) لە سەری هەرەمەکە و کاربەدەستانی تریش لە بەشەکانیتری هەرەمەکەدان . نهۆمی (خانە) ی پاش ئەمانە (سکرتێری کۆمیتەی ناوەندی (C.C) ی حزبی کۆمۆنیست و سکرتێری حزبی کۆمۆنیستی کۆمارەکانی ڕووسیا و سکرتێری کۆمیتەی ویلایەتەکان و (کۆمیتەی کرایی . ئەو کۆمیتەیەی کە بەڕێوەبردنی پارێزگاکان و ناوچە ئۆتۆنۆمییەکانی لە ئەستۆدایە)) دەگرێتە خۆ . ئەم دەستەیە دەتوانرێ بە مافیای یەکێتیی سۆڤیەت بناسێنرێن، چونکە هەموو یەکێتیی سۆڤیەت و

میللەتانی ئەم وولاتە پان و بەرینە لەژێر فەرمانڕەوایەتی تەواو و بەڕێوەبەرایەتی ئەم دەستەیەدایە . هەموو شتێک لەم وولاتەدا دەستکەوت و سامانە ماددییەکان هی ئەم دەستەیەن . کاربەدەستە پایە نزمەکانی تر خاوەنی ئەو دەسەلات و دەسکەوتە نین ئەوان تەنها جێبەجێکەری فەرمانەکانی (دەستەی مافیا) ن، واتە سەرانی هەرەمی ڕێبەرایەتی و دەبێ مەبەست و خواستی کاربەدەستە پایە بەرزەکان (مافیای ڕووسیا) بەجێ بگەیەنن . بەلام ئەم دەستەیەش خاوەنی دەسەلاتی بێ وێنە و بەرچاوون و بەدەوری خۆیان سوودی ماددی زۆر دەبینن.

ئەم دەستەیەی کە لە لوتکەی هەرەمی ڕێبەرایەتی یەکێتیی سۆڤیەتیدان یانی ئەندامانی سەرەکی مافیای ڕووسیا لە (K.G.B) یانی پاسەوانی پارێزگاری بەرژەوەندی و سوودەکانیان کەلک وەردەگرن . (K.G.B)هەموو خانەکانی پێکهێنەری کێلگەکان، کارخانەکان، زانکۆکان، بەڕێوەبەرایەتییەکان و تەنانەت خێزانەکانیشی خستۆتە ژێر چاودێری تەواو و ووردی خۆیەوە . ڕۆژنامە و گۆڤار و بلاوکراوە و چاپەمەنی و دەزگاکانی پەیوەندییە گشتییەکان نەک تەنها لەلایەن (K.G.B) یەوە کۆنترۆل دەکرێن، بەلکو زۆر جار لەلایەن خۆیەوە بلاودەکرێنەوە.

پلەی دووەمی مافیای ڕووسیا دەخرێتە پال نوێنەرە پایە بەرزەکانی دامودەزگا پیشەسازییەکان و دەستەیەک لە ئەفسەرە پایەبەرزەکانی هێزی چەکدار و دەستەیەک لە زانایان کە هەموویان ئەندامی حزبی کۆمۆنیستن . پەیکەری ئەم دەولەتە گۆڕدراوە بۆ سیستەمێکی تایبەتی (پالەپەستۆ خستنە سەرخۆ) . هەر ئەندامێکی ئەم پەیکەرە کە لە یەکێک لە پلیکانەکانی هەرەمەکە جێگای گرتووە ناچارە بۆ پارێزگاری لە دەستکەوت و لەدەست نەدانی بەهرەکانی فیداکاری و هەول بدات لەم سیستەم و ڕژێمە بەرگری و پارێزگاری بکات . ئەم کارەش دەسەلات و توانا دەبەخشێ بە حزب و مەکتەبی سیاسی و

دەوڵەت تا هاوولاتیانی رووسیا بەشێوەیەکی باشتر و زیاتر کۆنترۆڵ و بیانخەنە ژێر فەرمانڕەوایەتی خۆیان.

تا ئەو جێگەیەی زانیاری و ئەزموونەکانم رێگای پێداوم هەوڵم داوە راستی رووی ئەو دەزگایە و رەفتار و دەستوورە فراوانەکانی (K.G.B)تان پێبناسێنم، بەلام لەوانەیە زۆر پێتان سەیر بێ گەر بزانن لەناو ئەم ئۆرگانەدا دەزگایەکی تری تایبەت هەیە کە ئەرکی کۆنترۆڵ کردنی وردی مامووررانی ئەم دەزگایە دەرەکەوێ کە هەڵاتن و نەجات بوون لە دەست دەزگایەکی ئەهریمەنی وەک ئەمە تا چ رادەیەک زەحمەت و دژوارە.

پێش ئەوەی باسی بابەتەکانیترتان بۆ بکەم راستی و رووداوی چۆنیەتی هەڵاتنم لە ئەڵمانیای رۆژهەڵاتەوە واتە لە (شوێنی کارو مامووریەتم) بۆ رۆژئاوا بۆتان باسی دەکەم.

## هەڵاتن لە ئەڵمانیا ڕۆژهەڵات

میلەکانی کاتژمێرە کۆنەکەی بەڕێوەبەرایەتی تایبەتی کۆمیتەی ئاسایشی نەتەوەیی ڕووسیا لە ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات هێشتا لەسەر کاتژمێر ٦ی بەیانی جێگیر نەببوو کە هاتمە نووسینگەی کارکردنم . من لە بەڕێوەبەرایەتیەدا لێپرسراوی دابین کردنی ئاسایشی لیوای چەکدارانی ماتۆڕی بووم کە یەێک بوو لە یەکەکانی سوپای سووری نیشتەجێ لەسەر خاکی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات . تا ئەو ڕۆژە ئەوە یەکەم جار بوو من وا زوو لە نووسینگەی کارەکەم ئامادە ببم، چونکە کاتی ئاسایی دەوام لە هەشتی بەیانییەوە دەست پێدەکات . بەڵام ئامادە بوونم وا بەزوویی ئەمجارە بۆ خواحافیزی کردن بوو لە ڕابردوویەکی دووروودرێژ و ئەنجامدانی ئاخرین ئەو هەنگاوانەی پێویستن بۆ ئەنجامدانی سەفەرەکە و ریسکە (مجازفە) گەورەکە یانی هەڵاتن بۆ ڕۆژئاوا و خواحافیزی لە ڕۆژهەڵات.

لەسەر بنەمای نەخشەی دانراوی پێشوو ئەم کارە لە پاش نیوەڕۆی هەمان ڕۆژدا ڕووی دەدا . بەڵام لەم بەیانییە زووەدا کە هێشتا کارمەندانی بەڕێوەبەرایەتییەکە ئامادە نەبوون بۆیە هاتبووم بۆ ئەوەی هەنگاوە کۆتاییەکانم پێویستی سەفەرەکەم ئەنجام بدەم . ئەو بەڵگەنامانەی کە پێویستم بوون بۆ ئەم سەفەرە لە جانتایەکی تایبەتدا شاردمەوە و دەمانچەکەم جارێکی تر تاقی کردەوە کە پێویست بوو بۆ ڕووداوە پێشبینی نەکراوەکان.

بارانیەکیشم لەگەڵ خۆمدا هێنابوو تا کاتی بەڕێکەوتنم لەژێر پاڵتۆ نیزامییەکەمدا لەبەری بکەم بۆ ئەوەی لە کاتی هەڵاتن بە لەبەرکردنی وەک غەیرە نیزامییەک خۆم نیشان بدەم . لەوانەیە لاتان

سەیر بێت کە ئەگەر بڵێم دەبوایە هەڵاتنی من لەسەر خاکی ئەڵمانیای ڕۆژئاواوە بێت و ئەم بڕیارەش لە پاش نیوەڕۆی هەمان ڕۆژدا پیادە دەبوو.

بەپێی بەرنامەیەکی لە پێشوو داڕێژراودا بڕیار بوو پاسێکی تایبەتی هاتووچۆ دەستەیەک لە ئەفسەران بە ڕواڵەت بۆ گەشتێکی کورت بباتە بەرلینی ڕۆژئاوا . بەڵام لە ڕاستیدا مەبەستی (K.G.B) لە دانانی گەشتێکی کورتی وادا بۆ هەڵسەنگاندن و لێکۆڵینەوە لە بارەی هێزەکانی هاوبەشی بریتانیا و ئەمریکا لە بەرلین و ئەنجامدانی هەندێ کار و چالاکی سیخوڕی بوو. لەوەش سەیرتر ئەوەبوو لە کاتێکدا کە من بڕیاری هەڵاتنم دابوو لەم گەشتەدا ئەنجامی بدەم کەچی ئەرک و مامووریەتی من وەک ئەفسەرانی پارێزگاری تایبەتی (K.G.B) ڕێگەگرتن بوو لە ئەگەری هەڵاتنی ئەفسەرانی بەشداری ئەم گەشتە کورتە.

من یەکەمین هاووڵاتی ڕووسی و یەکەمین ئەفسەری (K.G.B) نەبووم کە ئەم کارە ئەنجام دەدەم بەڵکو زۆر لە کەسانی تر کە هەلیان بۆ ڕەخسابێ ووڵاتی خۆیان بەجێ هێشتووە و هەڵاتوون. کاتێ کە هەموو ئەو ئەفسەرانەی کە بڕیاربوو بە پاس بچنە بەرلینی ڕۆژئاوا و بەشداری ئەم گەشتە بکەن لە بەرامبەر بارەگای لیوای ماتۆڕی ئامادەبوون بارانیەکەم کردەبەر و بە دوای ئەویشدا پاڵتۆ نیزامییەکەشم بە هەمان شێوە بۆ شاردنەوەی ئەوەی یەکەم کردە بەر . دەمانچەکەم هەڵگرت و جانتا پڕ لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی (K.G.B) کە پێشتر ئامادەم کردبوون بە دەستمەوە گرت و چوومە ناو کۆمەڵێ ئەفسەرە ئامادەبووەکان.

گفتوگۆی ئەفسەرەکان و هەندێ جاریش گاڵتە و قسەکردنیان لە ناو پاسەکەدا زنجیرەی بیرکردنەوەی تێک دەدام . قسەکانیان

لەبارەی بابەتێکی تایبەت نەبوون . هەندێکیان باسی بیرەوەری سەفەرەکانی پێشووی خۆیان دەکرد بۆ ئەڵمانیای ڕۆژئاوا و دەستەیەکیش سەرگەرمی گاڵتە و قسەی خۆش بوون.

ئەفسەرێکی گەنج کە پلەی دکتۆرای پزیشکی هەبوو بە دەنگی بڵند بە گاڵتەوە گوتی :- چەند خۆش دەبوو ئەگەر توانیبامان لە بەرلینی ڕۆژئاوا لە مەلهەیەکی ژێر زەوی بدەین . ئەوانیتریش کەوتنە سرتە سرت و زەردەخەنەی مانادار داکۆکیان دەکردە سەر پێشنیاری ئەم ئەفسەرە گەنجە و پاشان بە سەرنجەوە سەیری منیان دەکرد.

من بە گاڵتە بەو ئەفسەرە گەنجەم ووت :- لەمەودوا لە سەفەرکردن بۆ ڕۆژئاوا بێ بەشت دەکەم، چونکە ئامادەیی وەرگرتنی ڕەوشتی سەرمایەداریت تێدایە. یەکێکی تر لە هاوڕێکانی گوتی :- (ئۆە ! میشا بێئاگا لەوەی ئەفسەرێکی دژە زانیاری لەگەڵ ئێمەدایە ؟)!

هەموویان بە قسەی ئەو ئەفسەرە هاوڕێیەیان کە هیچ جێگای پێکەنینیش نەبوو، پێکەنین.

مولازمە گەنجەکە لە کاتێکدا هەوڵی دەدا خۆی لەم داوە ڕزگار بکا و بابەتەکە بگۆڕێ و گوتی :- هاوڕێ میاگۆف . ئەگەر حزب فەرمان بدا بە هەموو قەناعەتەوە مەلهەکە لەبیر خۆم دەبەمەوە.

یەکێک لە ئەفسەرەکان کە بەینی لەگەڵ من خۆش بوو سەری هێنایە نزیک گوێم و گوتی:- ئەلیکس قسەی ئەم ئەفسەرە گەنجە قسەیەکی خۆشم دێنێتەوە یاد . لە ڕووسییەک پرسیان، ئایا ئامادەی لەگەڵ ئافرەتێکی ڕووت لەسەر پشتی ژووژکێک دابنیشی؟

ڕووسیەکە وەڵامی دایەوە و گوتی :- بەڵێ، بەڵام بەم مەرجانە یا تیغەکانی ژووژکەکەیان تراشیبێ یان ئافرەتەکە هی من نەبێت وە یان حزب فەرمان بدات. لە گاڵتەی ئەم ئەفسەرە هاوڕێیەم بە دەنگێکی بڵند

پێکەنیم بە شێوەیەک کە هەموویان ڕوویان لە من کرد و سەیریان پێهات کە ماموورێکی دژە زانیاری بەم شێوەیە بە دەنگی بڵند پێدەکەنێ و خۆشحاڵ دێتە بەرچاو . ئەمەش بووە هۆی ئەوەی جارێکی تر بازاڕی گاڵتە و پێکەنین گەرم بێت.

)نەقیب سیکۆیۆف) کە لە تەنیشت منەوە دانیشتبوو لە کاتێکدا بەدەست هێمای بۆ جانتا دەستییەکەی من دەکرد بەدەنگێکی بەرز کە هەموو بەباشی گوێیان لێی بوو گوتی-:

هاوڕێ میاگوف، بە دڵنیاییەوە لەناو جانتاکەی تودا بەڵگەنامەی نهێنی زۆری تێدان کە دەتەوێ تەسلیم بە ڕۆژئاوایان بکەیت هەموویان دیسانەوە بە دەنگێکی بڵند پێکەنین و دەست خۆشیان لە گاڵتەکەی (نەقیب سیکۆیۆف) کرد، ئەوە لە کاتێکدا تەنها کەسێک بووم کە دەمزانی لەناو جانتا دەستی یەکەمدا بەڵگەنامەی زۆر گرنگی نهێنی هەن کە تا چەند کاتژمێرێکی تر لەگەڵ مندا بۆ هەمیشە (K.G.B) بە جێ دەهێڵن.

هێشتا هاوسەفەرەکانم سەرگەرمی دەربڕینی بیروبۆچوونیان بوون لەسەر جانتا دەستییەکەی من و هەندێکیشیان بە گاڵتە و پێکەنینەوە دەیانووت :- کە جانتاکە دەزگایەکی تۆمارکەری دەنگی تێدایە و گوایا من سەرگەرمی تۆمارکردنی هەموو ئەو قسانەم کە لەناو پاسەکەدا دەکرێن.

پەڕینەوەی پاسەکە لە سنووری بەرلینی ڕۆژهەڵات ڕاوەستانی لە بەرامبەر خاڵی پشکنینی سنووری کۆتایی بە هەموو قسە و باسەکان هێنا . ماموورێکی سنووری هێزە هاوپەیمانەکان لە پاسەکە بەسەرکەوت و سەرگەرمی ژماردنی نەفەرەکانی پاسەکە بوو . پاش ڕێوڕەسمی پێویست دیسانەوە پاسەکە بەڕێکەوت و لە بەرامبەر دامەزراوە سەربازییەکانی هاوپەیمانان تێپەڕی و پاشان لە بەرامبەر یەکەمین شتی سەرنج ڕاکێشەری توریستی کە کەوتبووە سەر ڕێگامان یانی

باڵەخانەی (شارلوتنبۆرگ) ڕاوەستاین . لەم شوێنەدا مۆڵەتم دایە ئەفسەرەکان کە لە پاسەکە بێنە خوارەوە و وێنەی فۆتۆگرافی بگرن . چوونە ژوورەوەی باڵەخانەکە ڕێگای پێنەدەدرا.

ڕاوەستانی دووەمی ئێمە لە بەرامبەر ((برادنبۆرگ) ی کە خانووی یادکردنەوەی سەربازانی ڕووسی بوو کە لە جەنگی جیهانی دووەمدا کوژرا بوون)، ئەنجام درا . لەم شوێنەدا ئەفسەرەکان هاتنە خوارەوە و دەستیان کرد بە وێنە گرتن . من لە کاتێکدا جانتا دەستی یەکەم بە توندی بەدەستمەوە گرتبوو لە نزیک ئەوانەوە ڕاوەستام بەشێوەیەک کە سەرنجی کەس ڕانەکێشم بۆ ئەوەی لە هەلێکی گونجاودا بچمە پارکی تەنیشتی بینایەی یادکردنەوەکە . بەینی من و پارکەکە لە سەد مەتر زیاتر نەبوو، بەڵام هەندێ لە ئەفسەرەکان بەشێوەیەک وەستا بوون کە بۆ گەیشتن بە پارکەکە دەبوایە لەبەرامبەر ئەواندا تێبپەڕم و ئەوەش نەدەکرا . بۆیە لەم نەخشەم پاشگە بوومەوە و بە ووردی تەماشایەکی دەورووبەری خۆم کرد و بۆ دۆزینەوەی ڕێگا چارەکیتر کەوتمە بیرکردنەوە . بڕیارمدا بچمە ناو بینایەی یادبوود و لە دەرگای پشتەوە بچمە پارکەکە . بەڵام دەبێ ئەم کارە ئەنجام بدەم بە بێ ئەوەی سەرنجی ئەفسەرەکان ڕابکێشم بچمە ناو بینایەکەوە؟ . دووبارە تەماشایەکی دەورووبەرم کرد هەموو سەرگەمی وێنەگرتنی یادگاری بوون و هیچ کامیان ئاگایان لە من نەبوو . بەکەڵک وەرگرتن لەم دەرفەتە چوومە ناو بینایەکەوە . بەبێ شک لە کاتی جوودابوونەوەمدا، هیچ یەک لە هاوڕێکانم ئاگادار نەبوون، چونکە ئەگەر وانەبوایە، دەبوایە کەڵک لە دەمانچەکەم وەربگرم و ئەمەش مەبەست و مەیلی من نەبوو.

بینایەکە مۆزەخانەیەکی بچووکی تێدایە و چەند کەسێکی توریست لە میللەتانی تر، سەرگەرمی دیداری مۆزەخانەکە بوون . من ئاگام لەوان نەبوو، چونکە دەبووایە هەرچی زووترە لەم شوێنە خۆم

نەجات بدەم و بچمە دەرەوە تا ئەفسەرەکان ئاگاداری وون بوونی من نەبوونە خۆم بگەیەنمە پارکی تەنیشت و لەوێوە خۆم لەم شوێنە دوور بخەمەوە . بەڵام تەنیا نەبووم و بە ناچاری کەوتمە پشت سەری دەستەیەک لە تەماشاکەرانی مۆزەخانەکە کە دەچوونە نهۆمی یەکەم . ڕاست خۆم وەک یەکێک دەهاتە بەرچاو کە مەلە نەزانێ و بیخەنە ناو دەریایەکی تۆفانییەوە . دڵەڕاوکێ و پەشۆکاوی لێدانی دڵ خێراتر کردبووم و هەستم دەکرد تووشی مەترسییەکی گەورە بوومە . کەوتبوومە پشت سەری کۆمەڵە خەڵکێک کە بە ئارامییەوە بەرەو دەرگای چوونە دەرەوە دەڕۆیشتن . حاڵەتێکی وەک سپرینگیم گرتبووە خۆ کە لەژێر فشاردا کۆکرابێتەوە و چاوم دەگێڕا بە پەلە کەلێنەک بۆ هەڵاتن و نەجات بوون لەم پاڵەپەستۆیە پەیدا بکەم . لە بارودۆخێک دابووم کە چەند چرکەیەک بۆ من چارەنووسساز بوون و دووچاری ئەو بێ شانسیە ببووم.

لەهەمان کاتدا دەرگایەکی بچووک لە گۆشەیەکیتری ساڵۆنەکە سەرنجی ڕاکێشام . تەماشایەکی دەوروبەرم کرد و کە دڵنیا بووم کەس ئاگای لەمن نییە بەرەو ڕووی ئەم دەرگایە چووم و دەرگام کردەوە و چوومە ژوورەوە و دەرگاکەم لە پشت سەرمەوە پێوەدا . بە کلیلەکەی لەناو دەرگاکەدابوو دامخست و لە کاتێکدا پشتم دابووە دەرگاکە سەرگەرمی تەماشاکردنی ژوورەکە بووم . دەوروبەرم پڕبوون لە تابلۆی جۆراوجۆر کە خرابوونە ناو چوارچێوەی جوان . دەرگایەکیتریش لە گۆشەیەکی ئەو ژوورەدا هەبوو.

لەم ژوورەدا پیرەمێردێکی ئەڵمانی لە پشت مێزێکەوە دانیشتبوو و سەرگەرمی نان خواردن بوو . پیرەمێردی ئەڵمانی کە منی بینی بەدەنگێکی سامناک و لە هجەی تایبەتی باکووری ئەڵمانیا گوتی :- ئای!!! خوای گەورە بە هەڵەدا نەچووم تۆ ڕووسی ؟

له جیاتی وەڵام دانەوەی پرسیاری پیرەمێردی ئەڵمانی پێم ووت :- مامە باشترە تۆ خواردنەکەت بخۆیت.

لەگەڵ ئەوەشدا کە من لە بارودۆخێکی یەکجار ناسک و جددی و پڕ مەترسی دابووم کەچی نەمتوانی ڕێگای پێکەنینم بگرم و بەتوندی پێکەنیم . بێ شکە کەس ناتوانێ بە دیتنی چاوی دەرپەڕیوو هەیکەلی سەرسوڕهێنەری پیرەمێردی سپی پێستی ئەڵمانیا کە پارچە گۆشتێکی لەناو دەست دابوو پێنەکەنێ . پرسیارم لێکرد :- ئایا ئەم بینایە دەرگای چوونە دەرەوەی بۆ پارک هەیە ؟

وەڵامی پیرەمێرد ئیجابی بوو . لەم کاتەدا تەلەفۆنی سەرمێزەکە سەرنجی ڕاکێشام خەیاڵێکی تازەم بۆ هات . (ڕاستی بۆچی پەیوەندی لەگەڵ پۆلیسی ئەڵمانیای ڕۆژئاوا نەکەم و هەنگاوی داهاتووم بە هاوکاری پۆلیس ئەنجام نەدەم ؟.

بۆیە بە پیرەمێردی ئەڵمانیم ووت :- من ئەفسەرێکی ئاسایشی ڕووسیم کە لە یەکەکەی (وحدە) خۆم هەڵاتووم . تکایە بە تەلەفۆن پەیوەندی بە پۆلیسی ئەڵمانیای ڕۆژئاوا یان بارەگای هاوپەیمانەکان بکە و ئاگادارییان بکە لەوەی ئەفسەرێکی ڕووسی داوای مافی پەنابەرێتی سیاسی دەکات.

پیرەمێردی ئەڵمانی سەرگەرمی ژمارەی تەلەفۆنی پۆلیس بوو کە دووبارە پێم ووت :- بە مامووررانی پۆلیس بڵێ سەیارەک بنێرنە پشت بینایەکە لە بەرامبەر دەرگای چوونە دەرەوەدا ڕایبگرن.

پاش ئەوەی پیرەمێردە ئەڵمانییەکە بەهۆی تەلەفۆن ڕووداوەکەی بە ناوەندی پۆلیس (مرکز الشرگە) ی ئەڵمانیای فیدڕاڵ ڕاگەیاند بۆلای من هات و وێڕای هیوا خواستنی بۆ سەرکەوتنی من نیازی چوونە دەرەوەی هەبوو لە ژوورەکەدا . یەکسەر واهاتە خەیاڵم

که لەوانەیە پیرەمێردە ئەڵمانییەکە پاش چوونە دەرەوەی لە ژوورەکە ڕووداوەکە بۆ ئەفسەرە ڕووسییەکان باس بکات کە هێشتا لە دەرەوەی مۆزەخانەکە بوون بۆیە داوام لێکرد کە تا گەیشتنی ماموورە ئەڵمانییەکان لەم ژوورە نەچێتە دەرەوە و لای من بمێنێتەوە . پیرەمێرد بە ناچاری داواکەی من قبوڵ کرد، چونکە دەیزانی ئەگەر پرکێشی و زۆری بۆ چوونە دەرەوە بکات ڕووبەڕووی توند و تیژی من دەبێت کە لە بارودۆخێکی زۆر ناسک و دژوار دابووم.

ئێستا دەبوایە بۆ هەنگاوی دووەم خۆم ئامادە بکەم . پاڵتۆ نیزامییەکەم کە پلە و پایە و بەندو نیشانەکانی سوپای سووری پێوەبوو دەرم هێنا و لەگەڵ کڵاوە نیزامییەکەم لە پشت ئەو مێزەدا شاردەوە کە لەژوورەکەدابوو . ئەو بارانییەی کە پێشتر لە ژێر پاڵتۆکەدا لەبەرم کردبوو دەبووە هۆی شاردنەوەی جلوبەرگە نیزامییەکەم . جگەرەیەکم داگیرساند و لەسەر کورسی دانیشتم . پاشان تکام لە پیرەمێردەکە کرد کە بچێتە لای پەنجەرە و ئەوەی لە دەرەوەی دەیبینێ بۆمی باس بکات.

پیرەمێردە ئەڵمانیەکە بە ئارامی چووە لای پەنجەرە و بە ووردی خەریکی تەماشاکردنی دەرەوە بوو پێی ڕاگەیاندم کە :- باسەکەی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات هێشتا لە بەرامبەر بینایەکە وەستاوە و ئەفسەرە ڕووسییەکان کۆمەڵ کۆمەڵ وەستاون و بە پەشۆکاوییەوە قسە لەگەڵ یەکتر دەکەن.

پاشان پیرەمێردەکە گوتی :- بە دڵنیاییەوە دەیانەوێ بگەڕێنەوە و چاوەڕێی تۆ دەکەن.

منیش گوتم :- ئێستا بە دڵنیاییەوە ئەفسەری پلە باڵای دەستەکە بە بێتەل ڕووداوەکەی ئاگاداری فەرماندەیی کردووە . هەر ئێستا لە سەرتاسەری ئەڵمانیای فیدراڵ و بە تایبەتی بەرلینی ڕۆژئاوا، ماموورانی (K.G.B) بۆ دۆزینەوەی من کەوتوونەتە گەڕان و چالاکی

نواندن . تا چەند خولەکێکی تر ئەم مامووړانە لە جلوبەرگی توریست یان لەژێر ناوی تری جۆراوجۆردا وەک مێروولە و کوللە دەڕژێنە ئەو ناوچەیەی منی لێ بزربووە . ئەگەر پۆلیسی ئەڵمانیای فیدراڵ زوو ئامادە نەبێ گیرۆدەی بوونی مِن بەدەستی هاوکارانی خۆم کارێکی چاوەڕوان کراو بێ شکە . هەستم بە ترس و خەتەر دەکرد . بۆیە لای دەرگای دووەم چووم و دەستگیرەکەم سووڕاند کە چی داخرابوو . لە گیرفانی جلوبەرگی خۆمدا بە دوای شتێکدا دەگەڕام تا بەڵکو بەهۆی ئەوەوە بتوانم قفڵی بکەم دەرگاکە بکەمەوە کە دەستم بەر کلیلی دەرگای ژوورەکەی پێشوو کەوت کە خستبوومە گیرفانم . کلیلەکەم دەرهێناو خستمە ناو قفڵی دەرگاکەی دووەم و سووڕاندم کە بەخۆشحاڵییەوە دەرگاکەی کردەوە . لە پشت دەرگاکە ڕاڕۆیەکی (ممر) درێژ دەبینرا . بە پیرەمێردەکەم ووت زوو دەگەڕێمەوە.

چوومە ناو ڕاڕۆکەو دەرگام لە پشت سەرمەوە داخست و دەستم بە هەڵاتن کرد . لە کۆتایی ئەم ڕاڕۆیەدا پلیکانێکی ئاسنی لێ بوو کە بە نهۆمی خوارەوە بەسترابوو . لە پلیکانەکان چوومە خوارەوە و گەیشتمە نهۆمی خوارەوە کە لێرەشدا فلزی گەورە دەبینرا . دەرگاکەم کردەوە و بەو پەڕی سەرسوڕمانەوە خۆم لە پشت بینایەکە دیتەوە.

لە کاتێکدا لەم دۆزینەوەیە زۆر خۆشحاڵ بووم بە پەلە هاتمەوە ناو بینایەکە و گەڕامەوە لای پیرەمێرد و پێم ووت :- بۆچی پۆلیسەکان نەهاتن؟ کات لەدەست دەچێ و دەبێ هەرچی زووترە کارێک بکەین.

ئەویش پێشنیاری کرد جارێکی تر لەگەڵ ناوەندی پۆلیس بە تەلەفۆن پەیوەندی بکاتەوە . پاشان ئەم کارەی ئەنجامدا و منی دڵنیا کرد کە پۆلیسەکان بە ڕێگاوەن و بە زوویی دەگەنە ئێرە.

میلەکانی کاتژمێر لە یەکی پاش نیوەڕۆ نزیک دەبوونەوە ئیتر چوونە دەرەوە لە بینایەکە نەدەکرا . بە دڵنیاییەوە ماموورانی (K.G.B) ئێستا چواردەورەی بینایەکەیان داوە و یان بەلانی کەمەوە لێی نزیک بوونەتەوە . لەبەر خۆمەوە جوێنم بە پۆلیسی ئەڵمانیای فیدراڵ دەدا کە تا ئەو ڕاددەیە لەبەرامبەر ڕووداوێک کە پەیوەندی بە ژیانی مرۆڤێکەوە هەبێت بەم شێوەیە کەمتەرخەمی دەکەن.

پیرەمێردەکەش هاودەردی من و دڵی دەدامەوە و منیش سوپاسی هەڵوێستم کرد .

کاتژمێر بە تەواوی یەکەمی دوای نیوەڕۆی نیشان دەدا . بڕیارمدا لە دەرگای پشتەوەی بینایەکە کە چەند خولەکێک پێشتر دۆزیبوومەوە بچمە دەرەوە و خۆم بگەیەنمە پارکی تەنیشت بینایەکە و لەوێوە بە تەکسییەک خۆم بگەیەنمە بارەگای فەرماندەیی هێزە هاوبەشەکانی، ئەمریکا، بریتانیا، فەرەنسا . بۆیە نیازی ئەوەم هەبوو خواحافیزی و سوپاسی پیرەمێردە ئەڵمانیەکە بکەم کەدەنگی پێی کەسێک لەناو ڕاڕۆکەدا سەرنجی ئێمەی ڕاکێشا.

ئایا دەبێ دەنگی پێی یەکێک لە ماموورانی (K.G.B) بێت؟ . دەمانچەکەم دەرهێنا و ئامادەم کرد . دەنگی پێیەکان بەتەواوی نزیک بە دەرگای چوونە دەرەوە دەهاتە بەرگوێ . ئێستا دەکرا بزانرێ دەنگەکان هی دوو کەس بوون. لە پشت دەرگای کەمینم گرت و پاش ئەوەی وام لێک دایەوە کە چەند مەترێک زیاتر لە دەرگاوە دوونین لە پڕێکا و زۆر بەخێرایی دەرگاکەم کردەوە و دەمانچەکەم ڕوو لەوان کرد.

دوو نەفەرم بە جلوبەرگی شەخسی لە بەرامبەر خۆمدا دیتن . ئەوان لەوەی کەمن ڕووە و ئەوان چەکم کێشاوە، تا ڕاددەیەک غافلگیر و ترسا و پەشۆکاو دەهاتنە بەرچاوە.

یەکێک لەوان هاواری کرد:-

چەکەکەت لابە . ئێمە پۆلیسین و بۆ بردنی تۆ هاتووین.

پاش ئەم قسانە بۆ دڵنیاکردنی من کارتی پێناسەی خۆیان دەرهێنا و لەسەر سەرم ڕایا گرت . پاش ئەم چەند چرکە ترسناک و دڵەڕاوکێیە هەستم بە ئاسوودەییەک کرد کە بەم زووانە لەم تەنگانەیە نەجاتم دەبێ.

دەمانچەکەم خستە گیرفان و گەڕامەوە ژوورەکە . پیرەمێردە ئەڵمانییەکە هەروا بەبێ دەنگی لە گۆشەیەک دانیشتبوو . سوپاس و خواحافیزیم لێکرد بۆ هاوکاری و لەگەڵ بوونم لەم چەند کاتژمێرەی ڕابردوودا.

لەگەڵ دوو پۆلیسەکەی ئاسایشی ئەڵمانیای فیدراڵ لە دەرگای پشتەوەی بینایەکە چووینە دەرەوە . پاش ئەوەی سواری ئۆتۆمبیلی پۆلیس بووم بەرەو خاڵی پشکنینی هاوبەشی هێزەکانی هاوپەیمان بەڕێکەوتین و پاش سێ خولەک گەیشتینە بارەگاکە . بۆ دەرکەوت کە بارەگای هاوپەیمانەکان ڕێک بەرامبەر ئەو بینایەیە بوو کە من خۆم تێدا شاردبۆوە و زۆر لێی دوور نەبوو . گلەییم لە مامورەکانی پۆلیسی ئاسایشی ئەڵمانیای فیدراڵ کرد کە بۆ بڕینی ئەو ماوە کەمە ئەوەندە منیان ڕاگرت و خستیانمە ژێر پاڵەپەستۆی ڕوحی و مەترسییەوە.

پاشان مامورەکانی ڕوونیان کردەوە کە درەنگ گەیشتنیان بەهۆی کەمتەرخەمی نەبووە، بەڵکو لەم ماوەیەدا لێپرسراوانی دەوڵەت سەرگەرمی لێکۆڵینەوە لەسەر داواکەی من و هەنگاوەکانی پێویستی بوون، بۆ بەخشینی مافی پەنابەرێتی بە من.

گەرچی لەم شوێنەدا هەستم بە ئاسایش دەکرد وا بە خەیاڵم دانەدەهات مامورانی (K.G.B) بتوانن لەم شوێنەدا ئازارێکم پێ

بگەیەنن، بەلام هێشتا جێگای مەترسی بوو، چونکە دەبوایە لەوێوە بگوازرێمەوە بۆ بارەگای فەرماندەیی هێزەکانی بریتانیا لە ئەڵمانیای فیدراڵ.

لێپرسراوە ئەڵمانییەکان لە بارەگای پۆلیسدا پێشوازی و خزمەتێکی زۆریان کردم و لەگەڵ ئەواندا سەرگەرمی خواردنەوەی قاوە و جگەرەکێشان بووم . لەم کاتەدا بیرم لە (ناتاشا) ی خێزانم دەکردەوە، کە ناچار بوو لە (مۆسکۆ) لە دادگا ئامادەبێ و لەگەڵ دەربڕینی بێزاری خۆی لە من بەهۆی (خیانەت بە وولات) داوای جیابوونەوەی غیابی لە دادگا بکات . دەمزانی دەوڵەت نەک تەنها ئەو ناچار بەو کارە دەکات، بەڵکو لەبەر ئەوەی هاوسەرەکەی بە ئەندامێکی تاوانبار بەرامبەر بە وولات لە قەڵەم دەدرێت کارەکەشی لەدەست دەدات. بەشێوەیەکی ئاسایی هیچ یەک لە خزمانی دوورو نزیکی هەر کەسێ کە بەشێوەیەک لە شێوەکان پەیوەندی خزمایەتی لەگەڵ مندا هەبێت، ئیتر لە یەکێتیی سۆڤیەت پلە و پایە و کارو پیشەیەکی دەوڵەتی گرینگی نابێت . لیستی ناوی هەموو ئەوانەی پەیوەندی خزمایەتی لەگەڵ هەبێت لە لیستی کەسانێک تۆمار دەکرێت کە هەمیشە دەبێ لەژێر چاودێری دابن.

دەبوایە دیسانەوە چاوەڕێی هاتنی ماموورە بریتانییەکان بکەم . ئەم چاوەڕێ کردنەش بۆ من زۆر ناخۆش بوو، چونکە بینایەی یادبووەکە لە دوورەوە هەروا لەبەر چاوانم بوو . پاسی هەڵگری ئەفسەرەکانم بە ڕوونی دەدیت . جگە لەمەش سەیارەیەکی (مۆسکۆڤیچ) و سەیارەیەکی (ڤۆلگا)ش لە دەستەکە زیادی کردبوو . هەموو ئەمانە گەواهی ئەوەیان دەدا کە چالاکییەکی فراوان بۆ دۆزینەوەی من دەستی پێکردبوو و بە دڵنیاییەوە تا ئێستا (مۆسکۆ)ش ئاگاداری ئەم ڕووداوە ببوو .

مامووره ئەڵمانییەکان هەوڵیان دەدا کە من لە بیرکردنەوەی خراپ ئاسوودە بکەن . ئەوان لە بابەت باری ناوخۆی ڕووسیا و لایەنی جۆراوجۆری ژیان لەم وولاتەدا پرسیاریان لێدەکردم . جلوبەرگی نیزامی من سەرنجی ئەوانی ڕاکێشا بوو . دوگمەکانی پاڵتۆ نیزامییەکەم لێکردنەوە و بەناوی یادگار دابەشم کرد بە سەریاندا . سەرەنجام لە دەورووبەری کاتژمێر ۲ی پاش نیوەڕۆ ملازمێک و دوو سەبازی بریتانی هاتنە ژوورەوە . ملازمە بریتانییەکە کورتە باڵا و سپی پێست بوو و بە هیچ شێوەیەک بە نیزامی نەدەهاتە بەرچاو . ملازمی بەریتانی ڕەفتارێکی خۆمانە و پڕ لە سۆز و میهرەبانی لەخۆی نیشان دەدا . قاچی ڕاستی کەمێک دەلەنگی . بە شەلە شەل خۆی گەیاندە لای من و خۆی ناساند و پیرۆزبایی لێکردن بۆ هاتنم بۆ ڕۆژئاوا و پاشان یەکسەر بە زمانێکی دەست و پێ شکاوی ڕووسی پرسی :- ئایا بەڕاستی من دەمەوێ لە ڕۆژئاوا بژیم؟

لە کاتێکدا بارودۆخەکە ڕێگای ئەوەی نەدەدا هیچ شتێک ببێتە هۆی پێکەنینی من بەڵام نەمتوانی ڕێگای زەردەخەنەیەک بگرم . من ژیانم خستبووە ئەو مەترسییەوە تا بگەیەنمە ڕۆژئاوا کەچی ئەو ملازمە بریتانیە پرسیاری وا سەیرم لێ دەکات.

ملازمە بەریتانیەکە کە هەستی کرد پرسیارەکەی لە جێگای خۆیدا نەبوو بێ ئەوەی وەڵامەکە وەربگرێتەوە پرسی :- ئایا چەکدارم یا نەخێر ؟

وەڵامم دایەوە :- بەڵێ، چەکدارم و دوای ئەوە دەمانچەکەم دەرهێنا.

ملازم کە هەستی بە جووڵانەوەی من کرد، بەخێرایی بۆ دواوە کێشایەوە و گوتی:

- چەکەکەت لەسەر زەوی دابنێ!!

منیش گوتم:

- کاکی ملازم، بۆ وا ترساوی؟ لەوانەیە واتان بە خەیاڵ دابێت من تیرۆریستم و هەموو ئەو بەرنامانە بۆ هاتنی من بۆ ئێرە دروست کراوە بۆ دەستدانە کارێکی تیرۆریستی.

ملازمی بریتانی لەوەی کە بەدیتنی چەکی من دووچاری ئەم ڕەفتارە ببوو، داوای لێبووردنی کرد . پاشان من و ملازم و دوو سەربازە بەریتانییەکە لە ناوەندی پۆلیس (مركز الشرگە) هاتینە دەرەوە . لە دەرەوەی بینایەکە و لە ناو حەوشەکەدا سەیارەیەکی زەیتوونی ڕەنگ سووڕایی لێبوو کە نیشانە و ژمارەی نیزامی لەسەر بوو، تەنانەت گلۆپی لەسەر سەقف و نیشانەی (M.P) یشی هەبوو بۆ بردنی من هاتبوو دیتنی ئەم سەیارەیە منی تووشی دڵەڕاوکێ و نیگەرانییەکی زۆر کرد، چونکە دەکرا بگووترێ تەنیا سەیارەی فریاکەوتن (إسعاف) لەم سەیارەیە ناسراوترە و ئەگەر مامووڕانی (K.G.B) بە دوای مندا هاتبن لە ئاسانی دەتوانن سەیارەکە دەست نیشان بکەن و بیناسن . دووچاری بارودۆخێکی ناخۆش ببووم . یەکێک لە سەربازەکان چووە پشتی سووکان من و ملازم لە کورسی دواوە دانیشتین و سەربازەکەی تریش لە تەنیشت شۆفێرەکە دانیشت و بەرەو دەرگای دەرەوەی ناوەندی پۆلیس بەڕێکەوتن . لەگەڵ ئەوەشدا کە دڵنیا بووم لەوەی کە ئەم سەیارەیە لەگەڵ هاتنە دەرەوەی لە ناوەندی پۆلیس دەخرێتە ژێر چاودێری ووردی مامووڕانی (K.G.B) یەوە کەچی خۆم دایە دەست چارەنووس و لە بارەگاکە هاتینە دەرەوە . پێنج شەش خولەک دواتر هەست کرد کە نیگەرانیەکەم لە جێگای خۆی دابوو و بە دوامان کەوتوون . مامووڕانی (K.G.B) بە بێ ئەوەی هەوڵی خۆشاردنەوە بدەن بەدوای ئێمەدا تا بارەگای هێزەکانی بەریتانیا لە ئەڵمانیای ڕۆژئاوا

هاتن . ئەوان سواری دوو سەیارە (مۆسکۆفیچێک و ڤۆلگایەک) ببوون کە هەڵگری ژمارەی باڵوێزخانەی ڕووسی بوون.

پاش گەیشتنە بارەگای هێزەکانی بریتانیا لە ئەڵمانیای ڕۆژئاوا منیان بردە بینایەی (انچباگ عسکری) و لە ژوورێکی بچووک دایاننام کە یەک پەنجەرەی تێدابوو و بە کاغەزی تاریک و ڕەش داپۆشرابوو . تاکە ڕووناکی ژوورەکە گڵۆپێک بوو لەناو پارێزەرێکدا (حافظە) کە بە بن میچەوە نووسێنرابوو . سویچی گڵۆپەکەش لە دەرەوەی ژوورەکەدا بوو . سەربازێکی بریتانیم لەگەڵدا بوو و تەنانەت لەکاتی چوونە ئاودەستیش منی بەجێ نەدەهێشت . چەند کاتژمێرێکی زۆر ناخۆشم لەم ژوورەدا بردە سەر کە بەبێ بەراوردکردن وەک سلوولێکی زیندان وابوو . سەربازەکە لەم ماوە زۆرەدا کە تەنانەت بە یەک وشەش لەگەڵ مندا قسەی نەکرد و داوای منیشی بۆ جگەرەکێشان قبوڵ نەدەکرد . کاتژمێر نزیکەی چواری دوای نیوەڕۆ ئەفسەرە بریتانییەکە هاتەوە بۆلام و پێی ڕاگەیاندم کە کاربەدەستانی وەزارەتی دەرەوە لە لەندەن لە بابەت منەوە لێکۆڵینەوەیان کردوە فەرمانی گواستنەوەی منیان بۆ لەندەن دەرکردوە.

لەوەی کە وەک زیندانییەک لەگەڵ مندا ڕەفتارکراوە گلەییم کرد و ئەویش گوتی :- بوونی تۆ لەسەر خاکی ئەم وولاتەدا وەک بۆمبێکی ئەتۆمی ویە کە هەر چرکەیەک لەوانەیە کاری خۆی بکات . ئێوە دەبێ ئەوە باشترین بزانن کە ئێستا لە دەوروبەری ئەم شوێنەدا ماموورانی (K.G.B)هەن هەر چرکەیەک لەلایەن ئەوانەوە ئەگەری ئەوە دەکرێ کارێک دژی ئێمە ئەنجام بدەن و هەنگاوێکی جووڵێنەری وا بهاوێن کە ببێتە هۆی ڕوودانی کارەساتێک.

پاش ڕۆیشتنی ئەم ئەفسەرە (ڕائد) ێکی بەریتانی کە تەمەنی لەدەوروبەری چل و پێنج ساڵ دەبوو هاتە لام و گوتی :- دەوروبەری

کاتژمێر ١٠ی شەو بەرەو لەندەن بە فڕۆکە دەکەوینە ڕێ . ئەو کاتی ڕۆیشتن لەلای من مایەوە . هەروەها گوتی:

- بۆ ڕێگە گرتن لە ئەگەری ڕوودانی ڕووداوی پێشبینی نەکراو کاربەدەستانی پاسەوانی بارەگای هێزەکانی بریتانیا لە ئەڵمانیای ڕۆژئاوا بڕیاردان داوە کە بە هەلیکۆپتەر بتانگوازنەوە بۆ فڕۆکەخانە . پاشان فەرمانی دا کە سەربازێک خاولی و ئاوی گەرم و کەرەستەی ڕیش تاشینم بۆ ئامادە بکات.

پاش ئەوەی ڕیشم تاشی لە کاتێکدا خۆتراشەکەم بە (ڕائد)ە بەریتانییەکە کردەوە کەچی وا پێ دەچوو ئەم گاڵتەیەی من بە هیچ شێوەیەک جێگای پەسندی ئەو نەبوو، چونکە یەکسەر فەرمانیدا کەرەستەی ڕیش تاشینەکە لە ژوورەکە ببەنە دەرەوە . پاش نیو کاتژمێرێکی تر دوو سەربازی تر لەکاتێکدا چەند بەستەیەکیان بە دەستەوە بوو هاتنە ژوورەوە و جلوبەرگی غەیرە نیزامییان بۆ من هێنابوو.

)ڕائد) ی بریتانی (هاری تامسۆن( Harry Tamson - پاشان فەرمانیدا جلوبەرگە شەخسییەکان ئەویش بهێنن . کاتژمێر ١٠ی شەو لەگەڵ (ڕائد هاری تۆمسۆن) لەکاتێکدا لەلایەن چوار سەربازی چەکدارەوە پاسەوانی دەکراین بە سەیارەیەک چووین بۆ شوێنی هەلیکۆپتەرەکان و سواری یەکێکیان بووین کە ئامادە کرابوو بۆ گواستنەوەی ئێمە بۆ فڕۆکەخانە و بەرەو فڕۆکەخانەی (بۆن) بەڕێکەوتین . پاش نزیکەی ١٥ خولەک فرین لە باندی دەوڵەتی فڕۆکەخانە نیشتین . پێشتر هەموو شتێ ئامادە و پێشبینی کرابوو بۆیە یەکسەر سواری فڕۆکەیەکی (لۆفپانزا( Lofthansa– بووین بە ماوەیەکی کەم فڕۆکەخانەی (بۆن) مان بەجێ هێشت و بەرەو لەندەن کەوتینە ڕێ.

لەناو فڕۆکەدا بێجگە لە ئێمە چەند ئەفسەرێکی بریتانی تیدابوون کە بۆ بەسەربرنی ماوەی مۆڵەتیان (إجازە) دەگەڕانەوە بریتانیا . (ڕائد تامسۆن) گوتی:

-سەرەتا بڕیار بوو ئێوە بە فڕۆکەیەکی بارهەڵگر و گواستنەوەی نیزامی بۆ لەندەن بگوازرێتەوە، بەڵام لە دوایین چرکەدا ئەم بڕیارە گۆڕدرا.

)ڕائد تامسۆن) بڕوای وابوو کە ئەگەری خرابوون و تێکچوونی فڕۆکەیەکی بارهەڵگری دوو ماتۆرە لە فڕینێکی درێژخایەندا لەم فڕۆکە نەفەربەرە (جێت) ە گەلێ زیاترە. من لەگەڵ (ڕائد تامسۆن) و دوو پاسەوان و خزمەتچییەک لە (پلەی یەکەم First Class – ) ی فڕۆکەکە ئاگاداری هەموو نەفەرەکان کرابوو کە هەموویان نیزامی و بەریتانی بوون لە ئەڵمانیای ڕۆژئاوا خزمەتیان دەکرد کە لە ماوەی فڕیندا بۆ لەندەن لە شوێنی ئێمە نزیک نەبنەوە . تەنها دوو جار فڕۆکەوانەکە و یاریدەدەرەکەی بۆ بەسەرکردنەوەی نەفەرکان بەلای ئێمەدا تێپەڕین.

ڕۆژی گەیشتنی فڕۆکەی هەڵگری من بۆ فڕۆکەخانەی (هیپرۆ Hethro) ــی لەندەن ٢ی شوباتی ١٩٧٤ بوو . ئەو ڕۆژەی شەڕێکی پڕوپاگەندەیی تازە لە بابەت منەوە لە بەینی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا دەستی پێکرد . ڕووسەکان بە هەر ڕێگایەک کە لەبەر دەستیان دابوو هەوڵیاندا لە دەنگدانەوەی هەواڵی پەنابەرێتی من بۆ ڕۆژئاوا ڕێگە بگرن و ئەوە بە ڕووداوێکی ئاسایی و بێ بایەخ لە قەڵەم بدەن . مۆسکۆ لە زۆر تووڕەبووندا جینگڵی دەدان لەبەر ئەوەی کاربەدەستانی (K.G.B) لە وونبوونی دۆسیە نهێنییە چەکدارییەکانی ڕۆژهەڵات لە ئەورووپای ڕۆژهەڵات و دۆسیە نهێنییە گرنگ و ئاسایشییەکانی ڕووسیا کە لەلایەن منەوە هێنرابوو بۆ ڕۆژئاوا ئاگاداریبوون.

ڕۆژی یەکەمی نیشتەجێ بوونی من لەندەن، نوێنەرانی باڵوێزخانەی ڕووسی لە لەندەن، چەند جارێک بە فەرمانی (مۆسکۆ) داوای دیداری منیان لە وەزارەتی دەرەوەی بریتانیا کرد و بەڵام من هەموو جار وەڵامم بە نەخێر دەدایەوە و چونکە بەڵگەیەکم نەدەدیت بۆ ئەم دیدارە . ئەوان مەبەستیان لەم دیدارە ئەوە بوو بەهەر شێوەیەک بێت هەوڵ بدەن وا لە من بکەن بگەڕێمەوە بۆ ڕووسیا. کاتژمێر ١٢ی نیوەڕۆ کاربەدەستانی بریتانی پەیامێکی تر دابە من و لەو پەیامەدا کاربەدەستانی سۆڤیەت ڕایانگەیاندبوو کە ئەگەر بگەڕێمەوە بۆ مۆسکۆ ئەوا لەمن خۆش دەبن و لێبووردنم بۆ دەردەکەن. بۆ کە ساڵانێکی زۆر لە ترسناکترین دەزگای سیخوڕی جیهان خزمەتم کردبوو زۆر ڕوون و ئاشکرابوو کە مانای لێبووردن یانی دوورخستنەوەی بۆ ئۆردوگاکانی سیبیریا و کۆمەڵە جەزیرەکانی (گولاک) یان تەنانەت لە سێدارەدان بوو

کاتێ کە ئەم داوایەی ئەوانیشم قبووڵ نەکرد دەوڵەتی ڕووسیا ئێمەی بە تاوانبار و قاتڵ بە بیروڕای جیهانی ناساند و گوتیان :- (ئەلکسی میاگوف) بە تاوانی کوشتن لە ڕووسیادا دەزگای یاسایی و پۆلیس بە دوایدا دەگەڕێن و بۆیە لەسەر بنەمای پەیمان و یاسا نێونەتەوەییەکان سەبارەت بە گێڕانەوەی تاوانباران بۆ وڵاتی خۆیان بریتانیا نابێ مافی پەنابەرێتی بدات بە (ئەلکسەندەر ئەلکسیڤیچ میاگوف) و دەبێ ئەم تاوانبارە بۆ دادگایی کردن بگێڕدرێتەوە ڕووسیا.

پاش ئەوەی ئەم تۆمەتە درایە پاڵم نوێنەرانی پەرلەمانی بریتانیا و دادگای دەوڵەتی هاتنە لام و گوتیان :- (ڕووسەکان تۆیان بە تاوانی کوشتن تاوانبار کردووە ئێمەش چاوەڕێی وەڵامی ڕەسمی ئێوەین. من لە وەڵامدا گوتم :- تا ئێستا بەهیچ شێوەیەک هیچ تاوانێکم ئەنجام نەداوە بە تایبەتی کوشتن (بە پلەی جنائی) . ئەوەی کە تا دوێنێ کاربەدەستانی ڕووسی بۆ خۆیان دەیانووت کە ئەگەر من بگەڕێمەوە ڕووسیا لێبووردنم بۆ دەردەکەن بۆ خۆی باشترین بەڵگەی بێگوناهی

منه. ئەم وەلامە یەکسەرەی من بە پشت ئەستووربوون بە بەڵگەی زیندووی بەهێز لەسەر بێتاوانی من بووە مایەی خۆشحاڵی و داکۆکی کردنە سەری لەلایەن کاربەدەستانی بریتانی و بەم شێوەیە دوا ڕێگەگرتن لە بەخشینی مافی پەنابەرێتی سیاسی بە من لەسەر ڕێگا هەڵگیرا وژیانی تازەی من لە ڕۆژئاوا دەستی پێکرد.

# باڵیۆزی ئەمریکی لە ئەڵمانیای ڕۆژئاوا و(K.G.B)

لە کتێبەکان و فلیمە سینەماییەکاندا ماموورینی نهێنی و سیخوڕی ئەو کەسانەن کە بەبەردەوامی تەقە دەکەن و یا ڕاوی خەڵکی تر دەنێن و بە دوایاندا دەگەڕێن . ئەمانە لە ڕێگرە ئاستەمە ترسناکەکان پازدەدەن و لەگەڵ ماموورینی دەوڵەتی دوژمنەکەیان دەکەونە شەڕەوە . نامەوێ بڵێم وانیە، بەڵام ئەو ڕووداوانە بە کەمی ڕوودەدەن . بۆ پێشکەوتنی کاری فکری و هۆش و لەگەڵ ڕۆیشتنی پێویستی بە زیرەکی و ئازایەتی زۆر هەیە.

ئێستا کە ماوەیەکە لە ڕۆژئاوا دەژیم هەندێ جار کە بیر لە ڕابردووی کارکردنم لە (K.G.B) دا دەکەمەوە و ئەم بیرەوەریانەم دێتەوە خەیاڵ دەیانخەمە سەر کاغەز بە ئومێدی ئەوەی لەوانەیە ڕۆژێک دابێت بتوانم بەشێوەی کتابێک بڵاویان بکەمەوە.

یەکێک لە بیرەوەرییانەم دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٦٣ ی میلادی . لەم ساڵەدا شەڕی ساردی نێوان (مۆسکو) و (واشنتۆن) گەیشتبووە بەرزترین ئاستی خۆی (K.G.B) . نیازی وابوو بەهەر شێوەیەک بێت دەستێک لە سەفارەتی ئەمریکا لە ئەڵمانیای ڕۆژئاوا پەیدا بکات . بۆ جێبەجێ کردنی ئەم مەبەستەش (K.G.B) گروپێکی ٢٦ نەفەری لە ماموورانی خۆی ڕەوانەی ئەڵمانیای ڕۆژئاوا کرد . ئەم گروپەی لەژێر ناوی جۆراوجۆردا وەک مامۆستای دانشگا، لێکۆڵەرەوە، توریست، بازاڕی و ناویتردا ڕەوانەی خاکی ئەم وولاتە کرد . منیش یەکێک بووم لەو گروپە.

ماوەیەکی زۆر لەسەر باڵیۆز و تەنانەت کونسولگەری ئەمریکا لە ئەڵمانیای ڕۆژئاوا کارکرا . ئێمە بەدوای ڕێگایەکدا دەگەڕاین کە بەو هۆیەوە بتوانین هەندێ کەس لە باڵیۆزخانەی ئەمریکا کاریان لەسەر بکەین و بیانکەین بە سەرچاوەی زانیاری وەرگرتنی خۆمان، لەوێدا . بۆ ئەم کارانەش بەپێی فەرمانەکانی (کۆمیتەی ئاسایشی نەتەوەیی) هەموو شێوە کارێک ڕێگای پێدراوە و بەکارهێنانی ئازادە . (شانتاژ)، بەرتیل دان، ترساندن و بەکارهێنانی توندوتیژی، لەم ڕێگایانەن کە زۆر بەکاری دەهێنن . خاڵە لاواز و بەهێزەکانی نێچیرەکە دەست نیشان دەکرێ بۆ ئەوەی لەدوایدا کەڵکی لێ وەربگرن . بۆ نموونە ئەگەر کەسایەتی دەست نیشان کراو ترسنۆک بێت ئەوا لەگەڵ ئەودا بە میهرەبانییەوە ڕەفتار دەکرێت . ئەگەر ئەندامانی خێزانەکەی و خزمەکانی خۆش بوێن ئەوا ئەمانە دەترسێندرێن . ئەگەر پلە و پایەکی فەرمانبەرێتی و کاری هەبێت ئەوا ئەم پۆستەی کاری دەخرێتە ژێر مەترسی لەدەست دانی و نموونەی تری وەک ئەمانە. هەروەها بۆ (شانتاژ) و خستنە ژێر پاڵەپەستۆی کەسایەتی دیاریکراو لەو بەڵگەنامە و وێنانە کەڵک وەردەگیرێت کە لە تاقیگا تایبەتییەکان (K.G.B) ئامادە و تەزویر دەکرێن.

بۆ بەداوگرتنی پیاو بەتایبەتی پیاوی خێزاندار لەو ژنانە کەڵک وەردەگیرێت کە مەشقیان دیوە چۆن لەگەڵ پیاوی دیاریکراو دۆستایەتی بکا و پەیوەندی لەگەڵدا پەیدا بکات . چەندین وێنەی ئەم پەیوەندییە نهێنییانە دەگیرێت و پاشان بۆ (شانتاژ) و فشار خستنە سەر ئەم پیاوە لەم وێنانە کەڵک وەردەگیرێن . بەلام بۆ ئێستاکە ئەم ڕێگایە بەزۆری ئەنجامێکی ئیجابی نادات، چونکە خیانەتی ژن و مێرد بە یەکتری لە ڕۆژئاوا لەبەر بڵاوبوونەوەی ئازادی جنسی بووەتە کارێکی ئاسایی و ناویان لێناوە (ئازادی حەز لە یەکتری کردن و ئازادی پەیوەندی ژن و مێردایەتی.

ئێمە زۆر هەوڵمان دا ڕێگایەک بدۆزینەوە بۆ بەدەست هێنانی بەڵگەنامە نهێنییەکانی باڵیۆزخانەی ئەمریکا لە ئەڵمانیای ڕۆژئاوا، بەڵام زۆربەی هەوڵەکانمان ئەنجامی نەبوو . ماموورێکی تایبەت (ژنێکی جوان) تەرخان کرا بۆ مەبەستی بەداوگرتنی (باڵیۆز تاماس) . ناوی ماموورە ژنەکەی (K.G.B) نهێنی بوو و خەڵکی ئەڵمانیای ڕۆژئاوا بوو . ناوبراو دەوری خۆی باش بینی و بە پێی قسەکانی ئەو بارودۆخەکە بەباشی بەڕێوە دەچوو و بەپێی مەبەست و نیاز بوو . (باڵیۆز تاماس) کەوتە ژێر کاریگەری ئەو ژنە . ماموورانی تایبەتی بەشی هونەری (K.G.B)ماوەیەک پێشتر ئەو خانووەی کە (باڵیۆز تاماس) لە دەرەوەی شار هەیبوو و زۆربەی دیدارەکانی لەگەڵ ئەم ماموورە تایبەتییە لەوێدا ئەنجام دەدا، خستبووە ژێر کۆنترۆڵی کامیرای نهێنی و توانیان سەرکەوتن بەدەست بێنن و لەم دیدارانەدا چەندین وێنەی کلاسیکی بگرن . ئێمە وای بۆ چووین کە بە سەرکەوتنی ئەم نەخشەیە دەتوانین باڵیۆزی ئەمریکا بەداو بگرین و بەکاری بهێنین.

ڕۆژی ١٢ی ئایار لە کاتێکدا کە (باڵیۆز تاماس) دەچووە ئەو خانووەی خۆی لە دەرەوەی شار بۆ دیداری ئەو ژنە بەپێی کاتی دیاریکراوی پێشوو کەچی لە جیاتی کچەکە چاوی بە ماموورینی (K.G.B)دەکەوێ . ماموورەکان بەبێ پێچ و پەنا سەرەتا یەکسەر خۆیان دەناسێنن و داوای هاوکاری لەو ڕژێمی ئەمریکاییە دەکەن . بەڵام کاتێ ڕووبەڕووی توندی وەڵام دانەوەی باڵیۆزی ئەمریکا دەبنەوە ئەو وێنانەی نیشان دەدەن کە لە بارودۆخی زۆر ناڕێک و نەگونجاودا . ئەو وێنانەی کە لەوانەبوو ئابڕووی ببەن . بەڵام بە پێچەوانەی بۆچوونی ماموورانی (K.G.B) ئەم تیرە نیشانەکە ناپێکێ و باڵیۆز ئامادەی هاوکاری کردنیان نابێت و پێیان دەڵێت کە وێنەکانی لەلاجوانن بە ئارەزووەوە پێی خۆشە چەند دانەیەکی بدەنێ بۆ ئەوەی بەناوی یادگاری لەلای خۆی ڕایانبگرێ و ئەوانیتریش بۆ هەر جێگایەک یان هەر

کەسێک کە مەبەستانە بینێرن و تەنانەت دەتوانن بۆ خێزانەکەم یا سەرۆکەکانیشم بیاننێرن، چونکە ئەو ماوەیەکی زۆرە دەیەوێ لە خێزانەکەی جیا ببێتەوە کە ئەم کارە پارمەتیدەرێکی باش دەبێت بۆ ئەو و لەلایەکیتریش هەروەها سەرۆکەکانیشی بە دیتنی وێنەکان ئاگاداری لەسەر وەزعی دبلۆماسییەکانیان لە دەرەوەی وولات پەیدا دەکەن و بە دیتنی وێنەکانیش هەندێ کەیف وەردەگرن. ئەم ڕووداوە وانەیەکی باش بوو بۆ ئێمە و لەو جارە بەدواوە کەمتر لە شێوە کارکردنە کەڵکمان وەردەگرت.

(K.G.B)شێوەی زۆر توندتری بۆ (شانتاژ) و خستنە ژێر پاڵەپەستۆی خەڵکی وولاتانیتر بەکاردەهێنا بۆ سیخوڕی کردن بە سوودی ڕووسیا.

# ڕووداوی خوێناوی ڕێگای (فون – راهر)

یەکێک لە بێ بەزەییترین و توندترین چالاکییەکانی (K.G.B) بۆ دەسکەوتنی زانیاری ڕووداوی ڕێگای (فون – راهر) بوو.

شاندەکێکی ئەمریکایی بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵ سەرانی ئەڵمانیا هاتبوون بۆ (بادن – بادن) . ماموورانی (K.G.B) هەر لە چرکەی هاتنیان ئەم شاندەکەیان خستبووە ژێر چاودێری و کۆنترۆڵی خۆیانەوە . سەرچاوە خەبەرییەکانی ئێمە لەناوەوەی هۆڵی کۆنفرانسەکە هەندێ زانیارییان دابووە ئێمە و ئێستا (K.G.B) دڵنیا بوو کە گفتوگۆی سەرانی ئەڵمانیای فیدراڵ و ئەمریکا بۆ مەبەستە سەربازییەکانە و بەڵام لە ماوەی سێ ڕۆژی کۆنفرانسەکە نەمانتوانی زانیاری تەواو پێویست لەسەر مەبەستەکانی ئەم گفتوگۆیە بەدەست بێنین.

شاندەکی ئەمریکایی بڕیار وابوو ڕۆژی ۱۷ی مانگی کانونی یەکەم خاکی ئەڵمانیای ڕۆژئاوا بەجێ بهێڵن . لە کاتێکدا کە چەند کاتژمێرێک زیاتر بۆ کۆتایی هاتنی کۆنفرانسەکە نەمابوو، ئەو کۆنفرانسەی کە هەوڵدرابوو زۆر بەنهێنی ببەسترێ و هەر بۆیەشە لە یەکێک لە شارە دوورەکانی ئەڵمانیای ڕۆژئاوادا بە ئەوپەڕی شاردنەوە و نهێنیدا کارەکانی بە ئەنجام دەگەیاند و تەنانەت پەیامنێری ڕۆژنامەکانیش لە بەستنی ئەم کۆنفرانسە بێ ئاگابوون . کەچی لەدوا چرکەکانی کۆتایی کۆنفرانسەکە لە (مۆسکۆ) ەوە فەرمانمان بۆ هات کە دەبێ بەهەر نرخێک بێت زانیاری زیاتر و تەواوتر لە ناوەڕۆکی گفتوگۆ نهێنییەکانی سەرانی هەردوو وولات بەدەست بهێنرێ دەگەڕێنەوە.

یەکسەر لە جێگای خۆم هەڵسام و (موقەددەم میخائیلیف و نەیقب لارۆخین) لەگەڵ من بوون . یەدەگی دەمانچەکەم خستە سەری و ئامادەم کرد بۆ تەقە پێ کردن هاوڕێکانیشم بە پەیڕەوی کردن لەمن ئەم کارەیان ئەنجامدا . دوای چەند دەقیقەیەک هەرسێکمان سواری سەیارەک بووین و بەخێرایی لەسەر شارێگای (فون – راهر) بەرەو شوێنی بەستنی کۆنفرانسەکە بەڕێکەوتین . بەهۆی بێ تەلەوە لە ڕێگا ئاگادار کراینەوە کە شاندەکی ئەمریکی بە سەیارەیەکی مارسیدسی ئەڵمانی بەرەو ڕووی ئێمە دێن . فەرمانم دا بە شۆفێری سەیارەکە کە ماموورێکی توند و دڵڕەق و خاوەن ئەزموونی (K.G.B) بوو لە ئەڵمانیا بەناوی (تیتۆف) کە سەیارەکە لەناو دارستانەکانی ڕێگای (فون – راهر) لە شوێنەک دا بشارێتەوە.

بە پەلە لە سەیارەکە دابەزین . لەوەش ئاگادار بووین کە سەیارەی هەڵگری شاندەکی ئەمریکایی بۆ ئەوەی بە نهێنی و سەرنجی خەڵکی ڕانەکێشێ بەبێ پاسەوان بەڕێکەوتووە). من موقەددەم میخائیلیف و تیتۆف) دارێکی ووشکمان بە زەحمەت هێنایە ناوەڕاستی ڕێگاکە و ڕێگامان گرت . (لارۆخین) یش جەگە گەورەکەی سەیارەی لە سندووقی سەیارەکە دەرهێنابوو و بە دەستیەوە گرتبوو . وا بڕیارماندا من و تیتۆف لە تەنیشت ڕێگاکە لە شوێنەک خۆمان بشارینەوە . لە دوورەوە دەنگی سەیارەک کە بەخێرایی نزیک دەبووەوە دەهاتە بەر گوێ . سەیارەکە مارسیدیسێکی مۆدێل کۆنی ڕەنگ ڕەش بوو . زۆر بە سەیارەیەکی ئاسایی دەچوو و کەس گومانی ئەوەی لێنەدەکرد ئەم شاندەکەی هەڵگرتبێ . ئێمەش کەوتبووینە گومانەوە نەوەکا ئەم سەیارەیە ئەوە نەبێت کە ئێمە مەبەستمانە . بەڵام لەم بارودۆخەدا تەنانەت ئەگەر ئەگەری زۆر کەمیش هەبێت کە ئەم سەیارەیە هەمان سەیارەی هەڵگری دبلۆماسییەکانە دەبوایە دەست بەکاربین.

)میخائیلیف و لارۆخین) وا خۆیان نیشان دا کە خەریکی لابردنی دارەکەن لەسەر ڕێگا . سەیارەی هەڵگری دبلۆماسییەکان ئێستا بەتەواوی لە ئێمە نزیک بوونەتەوە و چەند چرکەیەک دواتر ڕاوەستان بە لێکدانەوەی خۆیان (کە بەڕاستی دارێک کەوتووەتە سەر ڕێگا و ماموورانی دارستان (غابات) سەرگەرمی وەلابردنی دارەکەن) کەچی ئەمانە ماموورى (K.G.B) بوون . لەم ماوەیەدا (من و تیتۆف) لە پشتەوە لە سەیارەکە نزیک بووینەوە و بێ ئەوەی بچووکترین هەل و درفەت بە شۆفێرە ئەڵمانییەکە بدەین کاردانەوەیەک بکات بە گوللە تایەکانی سەیارەکەمان پەنچەرکردن . پاشان (میخائیلیف و لارۆخین) بە توندوتیژییەک کە من تا ئەو ڕۆژە توانای ئەوەم نەبوو بە خەیاڵیشم دابێت بە جەگی سەیارە و گاشە بەرد شووشەکانی تەنیشتی سەیارەکەیان شکاندن . شۆفێرەکە هەوڵیدا بەتایەی پەنچەرەوە خۆیان لەم تەنگژەیەی تێی کەوتوون نەجات بدات ئەمریکییەکانیش لەناو سەیارەکەوە بەبێ نیشانە گرتن، ڕەشاوێژ، تەقەیان دەکرد، بەڵام بەشێوەیەک پەشۆکاو بوون کە زۆربەی گوللەکانیان بەر سەقفی سەیارەی خۆیان دەکەوتن . دەمانچەکەم دەرهێناو پاشان پەلاماری دەرگاکەم دا و کردمەوە کە لە پشتەوە داخرابوو پاش ئەوەی لەلایەن (لارۆخین) بەهۆی جەگی سەیارە شووشەکە شکێنرابوو ئینجا پەلاماری یەکێک لە ئەمریکییەکانم دا و هێنامە خوارەوە . لە ماوەیەکی کورتدا هەر سێ ئەمریکاییەکە و شۆفێرە ئەڵمانییەکەی بەڕێوەبەرایەتی پێشوازیکردنی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئەڵمانیا لەسەر زەوی درێژکرابوون . میخائیلیف لەسەر سەریان وەستابوو و لەکاتێکدا بە چەکەکەی ئەوانی دەترساند لەوکاتەدا من و (لارۆخین و تیتۆف) خەریکی پشکنینی زۆر بە ووردی هەموو شوێنەکانی سەیارەکە بووین و تەنیا چەند قونکە جگارەیەک لەناو جگەرەدانەکە و گۆڤارێکی ئەڵمانی (شتێرن) مان لە ناو سەیارەکەدا دۆزییەوە لەمە زۆر توڕە بووین . ئەم خەبەرەمان بە (میخائیلیف) ووت و ئەویش زۆر توڕە بوو و بە

شێوەیەک ددانەکانی لە یەک دەخشاندن کە گوێمان لە دەنگی لێک خشاندنەکە دەبوو . بە فەرمانی (میخائیلیف) سەیارەکەی وەزارەتی دەرەوەی ئەڵمانیای ڕۆژئاوامان کێشایە ناو درەختەکان . پاشان (میخائیلیف) دەمانچەکەی هۆی کە دەنگ کپ کەر (کاتم الصوت) ی پێوەبوو خستیە سەر ناوچەوانی شۆفێرە ئەڵمانییەکە و لەبەردەم چاوی زەقبووەوەی ئێمە و دبلۆماسییە ترسێندراوەکان سێ جار لەسەر یەک تەقەی لێکرد و کۆتایی بە ژیانی شۆفێرە ئەڵمانییەکە هێنا . پاشان بە دەنگێک کە ترسی لێدەباری بە دبلۆماسییەکانی ووت :- ئەگەر بەڵگەنامەی کۆنفرانسەکەمان تەسلیم نەکەن هەرسێکتان بەبێ ڕاوەستان دەکوژم.

یەکێک لە ئەمریکییەکان کەوا پێ دەچوو لە دوانەکەیتر بەتەمەنتر بێت، گوتی :- بەڵگەنامەکان لە شوێنی کۆنفرانسەکە ماونەتەوە بۆ ئەوەی لە دواییدا بە سەیارەیەکی باڵوێزخانە بنێردرێن بۆ دەرەوە و ئێمە هیچ وێنەیەکمان لەگەڵ خۆماندا نەهێناوە.

هەموو لەشیانمان پشکنی و تەنانەت بەری چاکەتەکانیشمان دڕاند، بەڵام بێ ئاکام بوو و هیچمان نەدۆزییەوە . بەمەش دەرکەوت کە دبلۆماسییەکان ڕاستیان دەووت . ئەوانیان بە سەیارەکی سادەو ئاسایی بەرەو فڕۆکەخانە ڕەوانەکردنەوە تا نوێنەرانی چاپەمەنی و ناوەندی بڵاوکردنەوەی دەنگ و باسەکان و پەیامنێرەکان بمبینێتەوە و هەروەها بەڵگەنامەکانی کۆنفرانسەکەش کە لەڕووی ئاسایشییەوە گرنگ و تایبەت و پڕ بایەخن دوایی بە سەیارەیەکی زرێپۆشی پۆلیس یان سەیارەیەک تایبەت بە باڵوێزخانە لە شوێنی کۆنفرانسەکەی ببەنە دەرەوە.

(میخائیلیف) پرسی :- سەرۆکی شاندەکی نوێنەرایەتی کامەیەک لە ئێوەیە ؟

دیسانەوە لە هەموویان بەتەمەنتر وەڵامی دایەوە :- هیچ یەک لە ئێمە پلەی سەرۆکایەتی بەسەر دووەکەیترەوە نییە و ئێمە نوێنەرانی هەر سێ هێزەکەی نیزامی ئەمریکاین . من ناوم (مەقەدەم شیفرز) لە هێزی هەوایی ئەم دووانەش (موقەددەم هاوارد) لە هێزی زەمینی و (دەریادار کالینز) لە هێزی دەریایی.

)میخائیلیف)، (دەریادار کالینز) ی هێنایە پێش و بە من و (تیتۆف و لارۆخین) ی ووت کە چاودێری دوو نەفەرەکەیتر بکەین کە ئێستا بۆمان دەرکەوت کە ئەفسەرانی (پنتاگۆن) ن.

)میخائیلیف) فەرمانی دا بە (دەریادار کالینز) چۆک دابدات . پاشان دەمانچەکەی خستە سەر گەردنی و دەنگە کەمەکەی تەقاندنی گولەکە لەناو (دەنگ کپ کەرەکە – کاتم الصوت) کۆتایی هێنا بە ژیانی دەریاداە ئەمریکییەکە لەبەردەم چاوی واق وورماوی دۆستەکانی.

)مەقەددەم شیفرز) لە کاتێکدا بەڕوونی دەنگی دەلەرزی و ڕەنگی تێک چووبوو بە (میخائیلیف) ی ووت :- ئێوە چیتان دەوێ ئێمە شتێکمان لەلا نییە بە ئێوەی بدەین . ئێمە لە بابەت شوێنی جێگیرکردنی مووشەکە ئەتۆمییەکان لەسەر سنووری هەردوو ئەڵمانیا لەگەڵ سەرانی ئەڵمانیای فیدڕاڵ گفتوگۆمان کرد.

موقەددەم دەیویست زۆر قسە بکات (میخائیلیف) پرسی :- چەند مووشەک لەسەر سنووری هەردوو ئەڵمانیا دادەمەزرێنن؟

پێش ئەوەی (شیفرز) وەڵام بداتەوە بە (میخائیلیف) م ووت :- ئێمە کاتی مانەوەمان لێرە نەماوە ڕێک تا پێنج دەقیقەی تر دەبێ سەیارەی دبلۆماسییە ئەمریکییەکان بگاتە شوێنی خۆی و بە درەنگ گەیشتنی ئەوان هەموو هێزی ئاسایش و بنکەکانی پۆلیسی ئەڵمانیا دەڕژێنە ئەم ناوچەیە.

(میخائیلیف) داوای لە (لارۆخین) کرد کە (موقەددەم هاوارد) بکوژێ . !

)لارۆخین) بە پەشۆکاوی وەستابوو . ئێمە لە ژیانمان دا تا ئەو ڕۆژە لەماوەی خزمەت کردندماندا لە (K.G.B) تاوانێکی وامان ئەنجام نەداوە). میخائیلیف) بە ترساندن بە چەک (موقەددەم هاوارد) ی دانیشاندە سەر زەوی و جارێکی تریش فەرمانەکەی خۆی دووبارە کردەوە). لارۆخین) هاتە پێش و لوولەی دەمانچەکەی خستە سەر گەردنی (هاوارد) و بە تەقاندنی دوو گوللەی یەک لە دوای یەک کۆتایی بە ژیانی موقەددەمە چاو شینە ئەمریکییەکە هێنا). موقەددەم شیفرز) وەک مرۆڤێک کە کارەبا گرتبی دەهاتە بەرچاو . دەنگی ووشک و کەم هەناسەی دەکێشا و ڕەنگی ڕووی بە تەواوی سپی ببوو و من وای بۆ دەچووم ئەم کابرایە هەر چرکەیەک لەوانەیە لە ترسان گیان لەدەست بدات و بمرێ). میخائیلیف) بە (شیفرز) ی ووت :- ئەوەی دێتەوە بیرتان بیلێن. (شیفرز) گوتی :- لێم ڕوونە کە دەمکوژی، کەواتە بۆ قسە بکەم.

)موقەددەم میخائیلیف) جارێکی تریش چەکەکەی بڵند کرد و ڕووی لە موقەددەمە ئەمریکییەکە کرد . ئێمە وای بۆ چووین ئێستا (میخائیلیف) بە هاویشتنی گوللەیەک ئەمەش دەکوژێ.

لەم کاتەدا بوو دەنگی ئاژیری (إنژار) سەیارەکانی دەهاتنە بەر گوێ کە لە ئێمە نزیک ببوونەوە . دەنگەکان هەر چرکە و زیاتر نزیکتر دەبوون . (موقەددەم میخائیلیف) فەرمانیدا هەمووومان سواربین . (شیفرز) ئەفسەرە ئەمریکاییەکە بە دەست و پێ بەستراوی لە کاتێکدا دەسرەیەکمان ناو دەمی خستە ناو سندوقی سەیارە.

)میخائیلیف) کۆمەڵێک بانگەواز کە بە زمانی ئەڵمانی نووسرابوون لە دەوروبەری جەنازەکان بڵاوکردەوە . ئەم بانگەوازە دەستکردانە لەلایەن (لایەنگرانی ئاشتی و کۆمەڵەی بەربەرەکانی کردن

دژی جێگیرکردنی چەکی ئەتۆمی لە ئەورووپا) ئیمزا کرابوون . ئەو دوو کۆمەڵەیە کە پەیوەندی و بوونی دەرەکییان نەبوو و دروستکەری دەستی (K.G.B) بوون . لەم بانگەوازانەدا هۆی کوشتنی دوو ئەفسەرە ئەمریکاییەکە (خەبات کردن دژی نەتەوەیی دژی دەسەڵاتی وڵاتە یەکگرتووەکان لە ئەڵمانیا و ئەورووپای ڕۆژئاوا) دەست نیشان کرابوون و ئاماژەش بەوە کرابوو کە ئەم جۆرە چالاکییانە بەردەوام ئەنجام دەدەن.

ناوەڕۆکی بانگەوازەکان بە شێوەیەک داڕێژرابوو کە سەد لە سەد سەرانی ئەڵمانیا و ئەمریکا قەناعەت پێ بکەن کە ئەم کوشتار و تاوانە بێ وێنەیە بەدەستی گروپە تیرۆریستییەکانی ئەڵمانیا ئەنجام دراوە . ئەم کارە دەبووە هۆی ئەوەی هەر کە جەنازەکان دۆزرانەوە سەرانی ئاسایش لە سەرتاسەری وڵات بە بەربڵاوی بۆ گرتنی تاوانباران ئەنجامدەری ئەم تاوانە دەست بکەن بە گرتن و زیندانی کردنی خەڵکێکی زۆر کە شکیان لەسەر بێت چالاکی دژی دەوڵەت ئەنجام دەدەن . ئەمانە لەلایەن دەزگا بەرپرسەکانەوە دەخرێنە ژێر لێکۆڵینەوە . ئەمەش خۆی لە خۆی دا دەبێتە هۆی پەیدابوونی ناڕازی بوون لەم ڕەفتارە بە بەربڵاوی لە ناو خەڵکدا و کاردانەوەی ناوەندە کۆمەڵایەتییەکان و ڕەنگ دانەوە لە دەزگا ڕاگەیاندنە گشتییەکان، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی بیروڕای گشتی لە ئاستێکی فراواندا هەمە لایەنە لەسەر هاتنی ئەمریکاییەکان بۆ ئەڵمانیای ڕۆژئاوا ئاگادار ببن و لە ئاکامیشدا دا بە سوودی نیازەکانی مۆسکۆ تەواو دەبێ.

هەروەها ئەم بانگەوازە دەست کردانە ڕێڕەوی بۆچوونی پۆلیسی ئەڵمانیای فیدراڵ و سەرانی ئەمریکایی لەسەر ڕاستی ڕووداوەکە دەگۆڕێ و فریویان دەدات.

سەیارەی (ڤۆلگا) بە ژمارەی دیبلۆماسی سەر بە باڵوێزخانەی یەکێتیی سۆڤیەت لەسەر ڕێگای (فون – راهر) کەوتەڕێ . ئەمە لە کاتێکدا ئەفسەری پایەبەرزی ئەمریکی (شیفرز) تەنیا کەسی کە لە شاندەکە سێ کەسییە ئەمریکییەکەی کۆنفرانسەکە زیندوو مابوو لەناو سندوقی پشتەوەی سەیارەکە بیری لە چارەنووسی نادیاری خۆی دەکردەوە. من و (تیتۆف) لە کورسی پشتەوەی سەیارەکە و بە واق ورماوی و پەشۆکاوییەوە دانیشتبووین و تەماشای (میخائیلیف) مان دەکرد کە بەو پەڕی دڵ ڕەقییەوە ماوەیەکی کەم لەمەو پێش دوو ئەمریکاییەکەی کوشتبوون . (نەقیب لارۆخین) سەیارەی لێدەخوڕی و هەوڵی دەدا هێمنی و ئارامی خۆی بەدەست بێنێ و نەشڵەژێ.

پێچ (لۆفە) ی یەکممان کە بڕی ڕووبەڕووی سەیارەکانی پۆلیسی ئەڵمانیا بووین . لە پشت سەری سەیارەکانی پۆلیس چەند سەیارەی تر دەبیندران کە بەبێ شک سەر بە بەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی نەتەوەیی ئەڵمانیا بوون.

)لارۆخین) هەوڵی دەدا لە دەستی ڕاستی شاڕێگەکە بەخێرایی دیاریکراوە سەیارەکە لێخوڕێ بۆ ئەوەی بەڵگە نەداتە دەست پۆلیسی ئەڵمانیا بۆ ڕاگرتنمان . ژمارەی سیاسی سەیارەکە ڕێگای بە پۆلیس نەدەدا سەیارەکە بپشکنێ، بەڵام لەم بارودۆخە تایبەتەدا ئەگەری ڕوودانی هەر ڕووداوێک چاوەڕوان کراو بوو.

)میخائیلیف) گوتی :- کەس دەست لە چەکەکەی نەدات . بەلانی کەمەوە لە ناو ئەم سەیارانەدا ٤٠ مامووری ئەڵمانی تێدایە و ئەگەرو توانای ڕووبەڕووبوونەوەمان نیە لەگەڵیان.

)لارۆخین) لەسەر سەیارە لێخوڕینەکە بەردەوام بوو . چوار سەیارەی پۆلیسی ئەڵمانیای فیدڕاڵ کە پڕ بوون لە مامووڕینی تایبەتی پۆلیس لە ئێمە تێپەڕین . یەکەمین سەیارەی مارسیدسی ڕەنگ ڕەش کە

سەر بە بەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی نەتەوەیی بوو کە گەیشتە لای ئێمە چراکانی داگیرساند و هێمای دا ڕابوەستین . هەروەها سەیارەکانی تریش بەدوای ئەودا ڕاوەستان.

)میخائیلیف) گوتی :- هێمنی بپارێزن ئێمە لە (ئاخن) دێین و لە ڕێگای فەرعی (شارل زاتینگ) ەوە هاتووینەتە سەر ڕێگای (فون – راهر. (

سەیارەکان نزیکەی ڕێگەی هەڵاتنیان لە ئێمە گرتبوو . ماموورە ئەڵمانییەکان کە دیار بوون هەموویان خەریکی هێنانەدەری چەکەکانیان بوون لەژێر چاکەتەکانیان و دەورەی سەیارەی ئێمەیان دابوو.

ئەو کەسەی کە پێدەچوو لێپرسراوی ئەوانیتر بێت هاتە پێش و سەری بۆ جامی دەرگای دواوەی سەیارەی ئێمە خوار کردەوە . جامەکەم هێنایە خوارەوە . ماموورە ئەڵمانییەکە سەلامی کرد و بەبێ ئەوەی چاوەڕێی وەڵامی سەلامەکەی بکات، پرسی :- ئێوە لە کوێوە دێن؟

پێش ئەوەی من جوابی ماموورە ئەڵمانییەکە بدەمەوە (میخائیلیف) بە زەردەخەنەوە گوتی :- ئایا ئێوە ژمارەی سەیارەکەتان نەدیوە؟ ئێمە ناچار نین وەڵامی ئێوە بدەینەوە. ماموورە ئەڵمانییەکە گوتی :- ئێمە تەنها دەمانەویست بزانین لەو ڕێگایەی ئێوە پێیداهاتوون، تووشی شتێکی نائاسایی بوونە یان نا؟ بە ڕێکەوت ڕووداوێکتان بەرچاو نەکەوتووە؟

)میخائیلیف) کە هەوڵی دەدا دەوری خۆی باش ببینێ و پێکەنی و گوتی :- نەمزانی کە لێپرسینەوە لە ڕووداوەکانی سەیارەش خراوەتە ئەستۆی پۆلیسی ئاسایشی ئەڵمانیا.

من له هێمنی و لەسەرخۆیی (میخائیلیف) سەرم سوورمابوو کە لەبەرامبەر ٢٥ کەس لە ماموورینی ئاسایشی چەکداری ئەڵمانی لەم بارودۆخەی ئێمە تێیدابووین سەرگەرمی گاڵتەکردن بوو لەگەڵ سەرۆکی گروپەکە . ئەوە لەکاتێکدا (شیفرز) ئەفسەری پایەبەرزی ئەڵمانی لەناو سندوقی سەیارەکەدا بوو و ئەگەر ئەڵمانییەکان بڕیاری پشکنینی سەیارەکەیان دابایێن بێگومان کاری ئێمە تەواو بوو و یەکێتیی سۆڤیەت تووشی ڕیسواییەکی گەورە دەهات . کوشتنی ئەو دوو ئەفسەری پایەبەرزی ئەمریکی و ڕفاندنی یەکێکی تر لەلایەن ماموورینی (K.G.B)، لەوانە بوو جیهان بخاتە بەردەم دەرگای ڕووبەڕووبوونەوەیەکی تری وێرانکەر و چارەنووسساز.

پێش ئەوەی ماموورە ئەڵمانییەکە لە بەرامبەر دوا ووتەی (میخائیلیف) کاردانەوەیەک نیشان بدات من گوتم :- ئێمە لە (ئاخن) لە کۆنسولگەرییەوە دێین و دەچینە باڵیۆزخانە لە (بۆن) . ڕێڕەویشمان لە شارێگای (گریق السریع) (شارل زایتنگ) تا چوارڕیانی (فون – راهر) بووە و لە چوارڕیانی سەرەوەتر هاتووینە سەر ئەم ڕێگایە . لەسەر ڕێگاشماندا تووشی هیچ ڕووداوێکی سەیارە لێخوڕین نەهاتووین.

لەڕووی مەبەستەوە داکۆکیم کردە سەر ڕووداوی سەیارە لێخوڕین بۆ ئەوەی خۆمان بەبێ ئاگا لەهەر ڕووداوێک نیشان بدەین.

بە ڕێکەوت ئەم دەربڕینەی من جێگای خۆی گرت و چونکە شوێنی ڕووداوەکە کە خۆمان ئەنجاممان دابوو دەکەوتە سەرووی چوارڕیانی (شارل زاتینگ) و (فون – راهر) . ماموورەکانی قەناعەتیان هات کە ئێمە بێ ئاگایین لەم ڕووداوە . ئەوان تا ئێستا نەیاندەزانی دوو ئەفسەری پایەبەرزی ئەمریکی کوژراون ئەگەر وانەبووایە بەبێ شک بەبێ گوێدانە ئەوەی ئێمە دبلۆماسین سەیارەکەیان بە وردی دەپشکنی و تەنانەت لەوانەبوو ئێمەش بە ناچاری ببەن بۆ وەزارەتی دەرەوەی

ئەڵمانیا. ماموورە ئەڵمانییەکە داوای لێبوردنی لە ئێمە کرد لەسەر ئەو چەند دەقیقەیەی کە ڕایگرتبوون بۆ ئەم چەند پرسیارە . بە وەلاکەوتنی سەیارەکانی ئەڵمانییەکان جارێکی تر سەیارەکەمان کەوتەوە سەر ڕێگای (فون – راهر) و بەرەو (بۆن) کەوتینەوە ڕێ.

من بە (تیتۆف)م کوت :- لەوانەیە موقەددەمە ئەمریکاییەکە لەناو سەیارەکەدا خنکابێ.

)میخائیلیف) گوتی :- گەر وابێ باشتر ئیتر گیروگرفتی دووبارە لێکۆڵینەوەمان لەگەڵیدا نابێ و ئەم دۆسیەیە دەبەسترێ . بەدوای ئەم گاڵتە بە ڕواڵەتیەی خۆی دەستی کرد بە پێکەنین.

)لارۆخین) کە ماوەیە بوو داوای گۆڕینی شوێنی ماموورییەتی لە ئەڵمانیا بۆ وولاتی خۆی ڕووسیا کردبوو بۆ مجامەلەکردنی (میخائیلیف) بە نابەدڵی و دەستکردەوە پێکەنی . من بیرم لە ڕۆژانێک دەکردەوە کە بۆ یەکەم جار هاتمە ناو ئەم دەزگا دۆزەخییە . دام و دەزگایەک کە لە سەرتاسەری جیهان خاوەن چاوو گوێ و سیخوڕانی زۆرە . کەوتمە بیرکردنەوە لەسەر ڕابردووی خۆم.

ئەو تاوانەی (میخائیلیف) ئەنجامی دا و بەو شێوە دڕندانە و بێ بەزەییەوە ئەو دوو ئەفسەرە ئەمریکاییەی کوشتن سەرەنجامی ئەو مەشقانە بوون کە (میخائیلیف) لە کۆلێژی ئەفسەری (ریازان – Ryazan)وەری گرتبوون کە ئەویش دەرچووی ئەم کۆلێژەیە وەک من کە شاهێدی ئەم تاوانە و شەریکی ئەنجامدانی بووم.

سەیارەی ڤۆلگا بە ژمارەی سیاسی کە شۆفێرەکەی (لارۆخین) بوو لە کاتێکدا (موقەددەم میخائیلیف) لە تەنیشتیەوە دانیشتبوو و من و (تیتۆف) لە کورسی پشتەوە بووین بەرەو (بۆن) کەوتبووە ڕێ و ئەمەو (موقەددەم شیفرز) ئەفسەری ئەمریکایی لەناو سندوقی سەیارەکەدا

زیندانی بوو من بە (میخائیلیف)م ووت :- جەنابی موقەددەم بە دڵنیاییەوە تا ئێستا لێپرسراوانی ئەڵمانیا ئاگاداری کوژرانی دوو ئەفسەرە ئەمریکاییەکە بوونە و خاڵی چوونە ژوورەوەی شارەکانیان کۆنترۆڵ کردەوە . بۆیە بە باشی نازانم بەم زیندانییە ئەمریکاییەوە بچینە ناو شار.

موقەددەم پێکەنی و گوتی :- ئەلیکس دیارە بەڕاستی ئێمەت بە مامورێکی سادە و کەم ئەزموون لە قەڵەم داوە؟ . کێ ووتوویەتی ئێمە دەمانەوێ بچینە (بۆن)؟ . ئێکو لە چوارڕیانی (کارل سروهە) دەچینە (فۆتنبروگ) گوندێکی دوورو و چۆل کە نزیکەی پشت گوێ خراوە.

گوندی پشت گوێ خراوی (فۆتنبروگ) کەوتبووە سەر سنووری هەردوو ئەڵمانیا و بەهۆی شوێنە سنوورییەکەی و مەترسی ژیان کردن لەم سنوورە کە هەمیشە لە بەینی هەردوو وولات گرژی هەیە لە دانیشتوان چۆل کراوە . پاسەوانانی سنووری ئەڵمانیای ڕۆژئاوا ئەم گوندەیان گوللە باران کردبوو. سەیارەکەمان ڕێڕەوی خۆی بەرەو (فۆتنبرۆگ) گۆڕی . ئێستا نزیکەی بۆم دەرکەوت کە ئەفسەرە ئەمریکییەکە دەگوازرێتەوە بۆ ئەڵمانیای ڕۆژهەلات بەلام ئەم کارە بە چ شێوەیەک ئەنجام دەدرێ بۆ منیش کە ئەفسەرێکی پایەبەرزی (K.G.B) بووم نەمدەزانی چۆن ڕوودەدات . وای بۆ دەچم لە چۆنیەتی گواستنەوەکە (موقەددەم میخائیلیف) یش ئاگاداری نەبوو . ئێمە خەڵکمان لە نێو ماموورانی سنووری ئەڵمانیای ڕۆژئاواو گومرگی فیدراڵ و تەنانەت لەنێو پۆلیس و بەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی نەتەوەیی ئەڵماندا هەبوو . ئێستا کە جێگری یەکەمی ڕاوێژکاری (صدر الاعظم) ی ئەڵمانیا بە تاوانی سیخوڕی بە سوودی یەکێتیی سۆڤیەت گیراوە دەتوانی باوەڕبکەی سیخوڕانی (K.G.B) تا چ ڕادەیەک خرابوونە ناو پەیکەری سیاسی، کۆمەلایەتی، نیزامی، ئەڵمانیای ڕۆژئاوا.

سەیارەی ڤۆلگا بە ژمارە سیاسییەکەی لە (فۆتنبروگ) لە بەرامبەر وێستگەی پشت گوێ خراوو نیوە وێرانی هێڵی شەمەندەفەر ڕاوەستا کە یادگاری ڕۆژەکانی کۆتایی شەڕی جیهانی دووەمە لەسەر خاکی ئەڵمانیا . بارانی شەوی ڕابردوو سیمایەکی تازەی دابووە تابلۆی سەوزی گوندەکە . چەند خانوویەکی وێران لەم شوێنە دوورتر دەبیندران.

موقەددەم بەبێتەلە بچووکەکەی (جهاز لا سلکی) کە لە شوێنەکی تایبەتی لە ناو سەیارەکەدا شاردرابۆوە لەگەڵ مامووەرەکانی ئەودیو سنوور لە ئەڵمانیای ڕۆژهەلات کە دۆستی ئێمەیە و لە ڕاستی دا لەژێر فەرمانڕەوایەتی دەسەلاتی (مستعمرە)ی ئێمەدابوون پێی ووتن :- کە ئەمانەتێکی لە وێستگەی شەمەندەفەر داناوە بۆ ئەوەی ئەوان هەنگاوی پێویست ئەنجام بدەن بۆ گوێزرانەوەی . ئەم ڕستانەی بە واژەی ڕەمز پێڕادەگەیاندن تا لە حاڵەتی کۆنترۆڵی گفتوگۆکە و بە دزییەوە گوێگرتن ئەڵمانییەکان ئاگاداری ئەم هەنگاوەی ئێمە نەبن کە ئێستا زۆر بە ووردی کەوتوونەتە هەوڵی هەمەلایەنە بۆ دۆزینەوەی ئەفسەری ڕفێندراوی ئەمریکایی.

پاش تەواوبوونی گفتوگۆکە بە فەرمانی (میخائیلیف) (لارۆخین و تیتۆف) هەردووکیان پێکەوە (شیفرز) یان لە سندوقی سەیارە هێنایە دەرەوە و بە ڕاکێشان بردیانە وێستگە وێرانکراوەکەی شەمەندەفەر . موقەددەمە ئەمریکاییەکە کە تووشی تەنگە نەفەسی و ناڕەحەتی زۆر و پەشۆکابوو و لەشی ئارەقەی زۆری کردبوو، هەوڵی دەدا ئەو پارچە پەڕۆیەی کە خستبوومانە ناو دەمییەوە فڕێ بدا و قسەیەک بکات . من بۆ (میخائیلیف) پێشنیارم کرد کەمێک ئاوی بدەینێ.

)میخائیلیف) لە کاتێکدا پێشنیارەکەی من تووڕە ببوو و گوتی :- هاوڕێ میاکۆف تۆ هەستت زۆر ناسکە.

قسەکردن لەگەڵ (میخائیلیف) کەڵکی نەبوو . پاش گواستنەوەی (موقەددەم شیفرز) بۆ ناو کەلاوەکەی وێستگەی شەمەندەفەر وا بڕیاردرا زۆر بە توندی لە ستوونێکی بەردی بینایەکەی ببەستینەوە بۆ ئەوەی بەخۆ خزاندن هەوڵی خۆ فڕێدان نەدات لەسەر بینایەکەوە . پاش ئەوەی دوا هەنگاومان ئەنجام دا موقەددەمە ئەمریکییەکەمان بە چارەنووسی نادیارییەوە لە گوندی (فۆتنبروگ)ی پشت گۆ خراو و چۆڵ لە دانیشتوان بەجێ هێشت و بەرەو (بۆن) کەوتینە ڕێ . زۆر ماندوو ببووین و وا هەستم دەکرد کە باری گوناهی هەموو تاوانەکانی کە تا ئێستا لە جیهان ڕوویان داوە بە تەنیایی کەوتۆتە گەردنی منەوە و خۆم بە تاوانبار دەزانی. ڕۆژنامەکانی بەیانی ئەڵمانیا هەموویان تیراژی سەرەکی و تایبەتی خۆیان دابووە، کوشتنی دوو ئەفسەرە ئەمریکییەکە و وون بوونی ئەفسەرێکی تری سوپای ئەمریکا.

ئەو بانگەوازەی (میخائیلیف) کە لە شوێنی ڕووداوەکە بڵاوی کردبوونەوە کاری خۆی کردە سەر دەزگاکانی ڕاگەیاندن . زۆربەی ڕۆژنامەکان ئەم تاوانە دەردناکەیان دەدایە پاڵ گروپە تێرۆریستییەکانی ئەڵمانیا و هەندێکیشیان لەسەر ووتاردا لەسەر بەناپەسەند و ناشیرین پێشاندانی کاری گروپە تێرۆریستەکانی ئەڵمانی ووتاریان بڵاوکردبۆوە . هەرای ڕفاندنی (موقەددەم شیفرز) لەسەر زمانی بڵاوکراوەکانی ئەڵمانیای ڕۆژئاواوە گەیشتە زۆربەی بڵاوکراوەکانی جیهان.

پنتاگۆن بە ڕەسمی بڵاوی کردەوە کە (موقەددەم شیفرز) بەهۆی پۆستی کاری خۆی زۆر نهێنی دەزانێ . ئێستا ڕوون بووەوە کە هۆی گواستنەوەی (موقەددەم شیفرز) بۆ پشت میلەکانی زیندان چی بوو . ئەوەی کە ڕوون بوو موقەددەمە ئەمریکاییەکە نەیدەتوانی خۆی لە بەرامبەر شکەنجە مۆدێرنەکانی (K.G.B) ڕابگرێ و بۆیە ئەوەی لە نهێنییە نیزامییەکانی ئەمریکا دەیزانی خستیە بەردەم سەرانی ڕووسیا . من تا ساڵی ١٩٧٥ لەسەر چارەنووسی ئەم ئەفسەرە ئاگادارییەکم

نەبوو، بەڵام پاشان لە ڕێگای دۆستێکەوە ئاگاداری وەزعی خراپ و بە ئازاری ئەو بووم . (شیفرز) ئەوەی دەیزانی لە بەرامبەر لیکۆڵەرانی (محققین) ڕووسی دانی پیادانا و سەرەنجام بەهۆی برینە زۆرەکانی و شکەنجەدانی و ناڕەحەتی زۆری دەروونی و ڕووحی گیانی لەدەستدا.

ئەم ڕووداوەم بۆیە بۆتان باسکرد، چونکە بۆ ماوەیەکی زۆر تەنانەت دوای پەنابردنی من بۆ ڕۆژئاوا ئەم تاوانە گەورە و دەردناکەن دەدرایە پاڵ گروپە جۆراوجۆرەکانی دەوڵەتی ئەڵمانیای ڕۆژئاوا وەک ڕێکخراوی (بادرماینهۆف. (

پاش دەستگیرکردنی دامەزرێنەرانی ئەم ڕێکخراوە یەکێک لەو تاوانانەی کە درایە پاڵیان کوشتنی دوو ئەفسەرە ئەمریکییەکە و ڕفاندن و فەوتاندنی (موقەددەم شیفرز) بوو.

ئەم ڕووداوە نیشانی دەدا کە چۆن مامووورانی (K.G.B) لە وولاتە جۆراوجۆرەکانی جیهان دەست دەدەنە کاری تیرۆریستی و ڕفاندنی مرۆڤ و تاوانیتری جۆراوجۆر و چالاکی خەراپکاری و بۆمب دانان و بڵاوکردنەوەی ترس و تۆقاندن پاشان تاوانەکان دەداتە پاڵ گروپە وەهمی و نەناسراوەکان . هەروەها مامووورەکانی (K.G.B) تەنانەت لە ئەنجامدان و ڕێکخستنی خۆپێشاندان و مانگرتنەکان لەزۆر لە وولاتەکانی جیهان لەسەر ڕێڕەوی بەرژەوەندییەکانی (مۆسکۆ) دەستیان هەیە.

مامووورەکانی (K.G.B) بەشێوەیەکی ئاسایی لەژێر پەردە و ناوی دبلۆماسی یا ڕۆژنامەنووسی دەزگا خەبەرییەکانی وەک (تاس و ئەوانیتر) لەم وولاتانەدا دەمێننەوە . ئەمانە سەرپەرشتی تۆڕێک دەکەن لە هاوکارەکانی خۆیان لە ناوخۆی وولاتی خانە خوێ دا کە هاوولاتی وولاتەکەن . خودی منیش لە ماوەی نیشتەجێ بوونم لە ئەڵمانیای

ڕۆژهەڵاتدا کاری ڕێکخستنی هاووڵاتیانی ئەڵمانیام بە ئەستۆوە بوو و تۆڕێکم لە سیخوڕانی ئەم وڵاتە بەڕێوەدەبرد.

## ماموورپیەتم لە ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات

بۆ بەدەست بەکاربوونم لە ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات لە ٢ی شوباتی ١٩٦٩ دا هاتمە وێستگەی گوندێکی ئەڵمانیای بە ناوی (زندورف) . ئەم گوندە لە زەمانی جەنگی جیهانی دووەمەوە و تا ئێستا ببووە بارەگای فەرماندەیی یەکەکانی سوپای ڕووسیا لە ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات . ئەو سەیارەیەی کە لەلایەن بەڕێوەبەراتی (K.G.B) یەوە ناردرابوو لە وێستگەی چاوەڕێی منی دەکرد . سەیارەکەم بە ئاسانی دۆزییەوە، چونکە لە مۆسکووە ژمارەکەیان پێدابووم.

ئەفسەرێک لەناو سەیارەکەدا بوو بەڵگەنامەکانی منی پشکنی و پاشان بەڕێکەوتین و بە نزیکەی کاتژمێرێک گەیشتینە (پتسدام) . بەڕێوەبەرایەتی (K.G.B) کە سەر بەهێزەکانی ڕووسیا بوو لە ئەڵمانیا نزیک بە شەقی شار بوو . دەورەی بینایەی ئەم بەڕێوەبەرایەتیە کە ناوچەیەکی فراوانی بەخۆوە گرتبوو بە دیواری بڵند دەورە درابوو چووینە لای ئەفسەری ئێشکگر (خفر) ئەویش ژوورێکی لە هۆتێلێک بۆ پەیداکرد و گوتی :- کاتژمێر ٩ی بەیانی دەبێ خۆم بە بەڕێوەبەری ئەو شوێنە بناسێنم کە ناوی سەر لە شکر بۆلدیرۆف) ە . وەک ئەوەی شتێکی دڵخۆشکەر لە هۆتێل چاوەڕێم بێت (بایکۆف) م بینی . ئەو (بایکۆف) ەی بەیەکەوە قوتابی و هاوپۆل بووین . بە دیتنی یەکتری ئەویش بۆ خزمەت کردن ڕۆژی پێشتر هاتووەتە ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات . بە دیتنی یەکتری شادمان و خۆشحاڵ بووین . پرسیارم لێکرد ئایا کارت دیاری کراوە؟

وەڵامی دایەوە :- نەخێر تا ئێستا نا بەیانی بڕیار دەدەن.

ئەویش دەبوایە کاتژمێر ٩ی بەیانی خۆی بە جەنەڕاڵ بناسێنی . وا ڕێککەوتین هەردووکمان بەیەکەوە لە یەک شوێن کار بکەین.

کاتژمێر ٩ی بەیانی لە کاتێکدا ڕیشمان بە جوانی تراشیبوو جلوبەرگی نیزامی ووتوکراومان کردبوە بەر و پرچمان جوان داهێنا بوو و ڕێکمان خستبوو چووینە نووسینگەی جەنەڕاڵ . ئەفسەری ئیشکگر، گوتی :- جەنەڕاڵ چاوەڕێی ئێوە دەکات.

جەنەڕاڵ بەدەست کورسی نیشان داین بۆ دانیشتن و هەواڵپرسی کردین . بە شێوەیەکی گشتی هەواڵپرسی سەرەتایەکە بۆ دەست بە قسەکردن . ئەو بە کورتی سروشتی کارە پڕ لە لێپرسراوێتییەکەی ئێمەی بەتایبەتی لە دەرەوەی وولات بۆ ئێمە باسکرد و هیواخوازی سەرکەوتنی ئێمە بوو و بەم شێوەیە گفتوگۆکە کۆتایی پێ هات . لە دوایدا تێ گەیشتین کە مەبەست لەم دیدارە کورتەی جەنەڕاڵ ئەوە بوو کە پیشانی ئەفسەرە گەنجەکان بدات کە تا چ ڕاددەیەک بایەخیان پێدراوە و چ کارێکی پڕ لە لێپرسراویەتی خراوەتە سەر شان.

دوایی (موقەددەم کۆستین (Kostin- لێپرسراوی کارگێڕی و کادیری بەڕێوەبەرایەتی (K.G.B) هەموو ووردەکارییەکانی باسکرد و کاری ئێمەی دیاری کرد . (موقەددەم) کورتە باڵا قەڵەو سەر بە تەواوی تاس بوو و چاوەکانی ڕەنگێکی نادیار و ڕووناکایی ژیانی بەدی نەدەکران . ئەفسەرێکی بۆرۆکراسی (مەکتەبی) گوێڕاڵ بوو و بە پێی فەرمانی سەرووی خۆی دەژیا و دەجووڵاوە و هیچ جۆرە هەنگاوێکی بەبێ فەرمانی سەروو ئەنجام نەدەدا . لە ماوەی بیست خولەکدا کاری ئێمە دیاریکرا و هەردووکمان کراینە ماموری لەشکری پاسەوانانی چەکداری مۆتۆڕی کە بارەگاکەی لە شاری (برنۆ) بوو . بڕیاردرا کاتژمێر ١٣ بە سەیارە بمانبەن بۆ ئەوێ.

)موقەددەم کۆستین) کە خۆی ئەفسەرێکی کادیر بوو دەستی کرد بە قسەکردن ستایش و پێدا هەلاگوتنی مەکتەبی سیاسی و سەرۆکایەتی (K.G.B) و دەوڵەت و لەم بارەیەوە تەوجیهات و ئامۆژگارییە پێویستییەکانی بە ئێمە ڕاگەیاند بۆ ماوەی دوو کاتژمێر کە من و (بایکۆف) گوێمان بۆ ڕاگرتبوو . هەروەها ستایشی کارە پڕ لە شانازییەکانی ماموورانی (چکا) ی کرد . موقەددەم بێ ئەوەی ئاگادار بێت لەماوەی ئەم دوو کاتژمێرەدا هەر بابەتێکی سێ جار دووبارە دەکردەوە . لە کۆتاییشدا لە کاتێک دا ئومێدی خواحافیزی کردنمان لە نووسینگەکەی لە دەست دابوو قسەکانی کۆتاییان پێ هات . پاش ئەوەی لە نووسینگەکەی وەدەرکەوتین تەماشای یەکتریمان کرد و بە دەنگێکی بەرز بەم هەموو زۆر بڵێیە پێ کەنین.

من گوتم :- ئەم پیاوە چەند قسە دەکات.

بایکۆف گوتی :- وا پێدەچێ مێشکی هەندێ تێک چووبێ.

جگە لە ڕستە بێ ماناکانی (کۆستین) شتێکیترمان لە مێشکدا نەمایەوە . ئاسان نییە کە هەر ووتەیەکی هیچ و پووچ و بێ مانا لە مێشکی مرۆڤدا بمێنێتەوە بە تایبەتی کە لەگەڵ ووشەی بەناو گەورەی وەک حزب، کۆمۆنیزم، سۆشیالیزم، کۆنگرە و مەکتەبی سیاسی کە هەریەکەیان سەدان جار دووبارە دەبنەوە ئاوێتە بووبێت.

ئەو ئەفسەرەی بۆ بردنی ئێمە بۆ (برنۆ) هاتبوو لە هۆتێل چاوەڕێی دەکردین . ئەفسەرێکی باڵا بەرزو لەبەر دڵان بوو . خۆی بە (نەقیب داڤیدۆف) ناساند و گوتی :- ئەوها ! کەواتە ئێوە لەلای ئێمە کاردەکەن . زۆر باشە ! ڤۆکای ڕووسیتان لەگەڵ خۆتان هێناوە ؟

پاش ئەوەی وەلامی ئێمەی بە ئیجابی گوێ لێ بوو یەکسەر پێشنیاری کرد کە هەر لەوێ بە سەلامەتی یەکتری و بەهۆی ئەم

دیدارەوە مەی بنۆشن. بەبێ گۆڕینەوەی قسەی ناپێویست بوتڵەکانمان خواردەوە . ١٠ خولەک دواتر سواری ئەو سەیارەیە بووین کە چاوەڕێمان بوو.

)داڤیدۆف) فەرمانی بە شۆفێرەکەدا بەرەو (برنۆ) بەڕێبکەوێ . کاتژمێر ١٤ لە (پتسدام) ەوە بەرەو (برنۆ) بەڕێکەوتین و نەقیب گوتی :- کاتژمێر ١٧ دەگەینە شوێنی مەبەست.

)برنۆ) نزیکەی کەوتبووە ٢٠ کیلۆمەتری باکووری ڕۆژهەڵاتی بەرلین و ئەم شارە نزیکەی سەد کیلۆمەتر لە (پتسدام) ەوە دوورە . دوو ڕێگا هەیە بۆ چوونە ناو ئەو شارە یەکێکیان لە ناو شاری بەرلینەوە ئەوەی تریان لە کەنارییەوە دەڕووات.

)داڤیدۆف) گوتی :- حەزم لێیە (بەرلین) تان پیشان بدەم بۆیە ڕێگای یەکەممان هەڵبژارد . سەیارەکە ڕێگای خۆی گرتەبەر . نەقیب کە پاش خواردنەوەی ڤۆدکا خۆش ببوو بە بەردەوامی قسەی دەکرد و تەنانەت گۆرانیشی دەووت . لە دوای کاتژمێرێک ڕۆیشتن لە (داڤیدۆف) م پرسی :- کەی دەگەینە بەرلین ؟

ئەویش پرسی :- کاتژمێر چەندە ؟

منیش گوتم :- کاتژمێر سێ یە ؟

گوتی :- سێ؟ پاشان بەبێ وەستان فەرمانی بە شۆفێرەکەدا بوەستێ و نەخشەکەی خۆی دەرهێنا و پاش ماوەیەک بیرکردنەوە گوتی :- ئێمە هەندێک لە ڕێگای خۆمان لامان داوە . لە جیاتی ئەوەی بۆ بەرلین بچین ئەوە کاتژمێرێکە بەرەو (لایپزیک) دەڕۆین.

)داڤیدۆف) پاش ئەوەی جنێوێکی بە شۆفێرەکەدا گەڕاینەوە و بەرەو بەرلین کەوتینە ڕێ.

لەوێ بۆمان دەرکەوت کە نە نەقیب و نە شۆفێرەکەی هیچ کامیان ڕێگای بەرلین پێ نازانن . بۆ ئەوەی سەرگەردانییەکەی ئێمەش تەواو بێت ڕۆژیش ئاوا بوو و هەوا تاریک ببوو.

)داڤیدۆف) سەیارەکەی لە زیک پیرەژنە ئەڵمانییەک ڕاگرت و ئێمەش چاوەڕێی ئاکامی گفتوگۆی ئەوان بووین کە بە زمانی ئەڵمانی بوو . بەڵام چاوەڕێی بوونەکەمان بەبێ سوود بوو . گەرچی ئەو دوو ساڵ بوو لە ئەڵمانیا بوو، بەڵام تەنیا ووشەیەک کە ئەو هێنایە سەر زمان (Frau) بو کە ماناکەی (خوشکە) یە.

قسەکردنی ئەو ووشە بە ووشە بەم شێوەیە بوو :- (خوشکە، ڕێگای برنۆ، کامەیە) ؟

ژنەکەش دەستی کرد بە ووتنی هەندێ شت بە زمانی ئەڵمانی

)داڤیدۆف) بە بەردەوامی سەری خۆی دەجووڵاند و بە ڕووسی دەیووت :- بەڵێ بەڵێ بەڵێ و پاشان دەرگای داخست و بە شۆفێرەکەی ووت کە بە ڕێبکەوێت.

شۆفێرەکە گوتی :- بە کوێ دا؟

ئەویش گوتی :- من چی بزانم!!!

لە ڕاستیدا ئەو تاکە ووشەیەک لە قسەکانی پیرەژنە ئەڵمانییەکە تێنەگەیشتبوو و پێکەنینی ئێمەش کاریگەرییەکی نەکردبووە سەر . نەقیب، تەنها ئەوەندەی ووت کە گوایا ئەڵمانییەکان لە بارودۆخێکی دژواردا ناچاربوون زمانی ڕووسی فێرببن.

نزیکەی دوو کاتژمێر بوو بەبێ هودە ڕێگامان دەبڕی و سەرگەردان ببووین تا گەیشتینە تابلۆیەک کە هێمای بۆ (پتسدام)

کردبوو و ئێمەی لەم سەرگەردانییە ڕزگارکرد . نزیکەی کاتژمێر ٢١ گەیشتینە بارەگای تایبەت بە لەشکری چەکدارانی (تفەنگدارانی) مۆتۆڕی

ئەم بارەگایە لە خانوویەکی دوو نهۆم دا بوو کە باخچەیەکی بە دیواری بڵندەوە هەبوو. من و (بایکۆف) هەردووکمان زۆر ماندوو ببووین و چووینە ناو جێگا بە ئومێدی ئەوەی خەوێکی خۆش و ئیستراحەت بکەین، بەلام ئەوەش خەیاڵ پلاو بوو کردمان.

کاتژمێر ٢ی نیوە شەو دەرگای ژووری نووستنی ئێمەیان لێداو (مولازم یەکەم) ێک هاتە ژوورەوە و گوتی:لە خەو هەستن ئەی نەژاد خراپەکان، من هاتووم بۆ ئەوەی یەکتر بناسین.

دیاربوو سەرخۆش بوو . دوگمەکانی چاکەتەکەی دانەخستبوو . کلاوەکەی سەری خوار ببووەوە و زەردەخەنەیەکی لەسەر لێوان بوو کە نیشانەی بەخێرهێنانی بوو . بە زمانێکی لاڵ (گنی) گوتی:

- ناوم (کۆستیا) یە کە کورت کراوەی (کۆنستانتین کۆرۆتیف)ە . پاشان ئێمەی لە ئامێز گرت و ڕۆیی.

)بایکۆف) گوتی:

- چ مرۆڤێکە ئەوەندە سەرخۆش بوو کە زمانی دەگیرا.

بەلام لە دواییدا بۆمان دەرکەوت کە لە منداڵییەوە تووشی زمان گیران بووە.

ڕۆژی دواتر لەلایەن (ڕائد ئەلیکسەندەر پترۆڤیچ بۆیچنکۆف – Aleksander Petrovich)سەرۆکی بەڕێوەبەرایەتی (K.G.B) یەوە بانگ کراین . من دەبوایە یەکەم کەس بچم.

)بۆیچنکۆف) پیاوێکی باڵا بەرز و هەیکەلێکی جوان و دەم و چاوێکی ڕەنگ گەنمی هەبوو . هەرچەندە خەڵکی ئۆکراین بوو، بەلام دەم و چاوی وا نیشانی دەدا کە خەڵکی ئاسیایە . چاوەکانیم خۆش ویستن، چونکە نیشانەی بەهۆشی و زیرەکی لەواندا بەدی دەکران . لەکاتی قسەکرندا هاتووچۆی دەکرد و ئەمەش ئەوە نیشان دەدا کە کەسایەتییەکی چالاکە.

بە ووردی گوێی لە قسەکانی من گرت و لەلای خۆی تۆماری کردن . هەندێ پرسیاری دەربارەی دەورانی خوێندن لێکردم و پاشان گوتی :- کە من بووم بە ماموری سێ فەوج (ێمر اللواو) لە لیوای ٨٢ ی پاسەوانانی چەکداری مۆتۆڕی کە بارەگا سەرەکییەکە دەکەوێتە (برنۆ. (

)داڤیدۆف) ماموری چاودێری بارەگای لیوا (مقر اللواو) و یەکەکانیترە و دەبێ کارەکەم لەگەڵ ئەودا ڕێک بخەم . ئەم هەواڵەم پێ خۆش بوو، چونکە (داڤیدۆف) م خۆش ویست.

)بۆیچنکۆف) پرسی :- ئایا ئەرکی خۆت وەک ئەفسەرێکی (K.G.B)دەزانی؟ وەلامم دایەوە :- بێگومان دەزانم . (لە کۆلێژدا ئەرکەکانی ئەفسەری (K.G.B) فێری ئێمە کراوە. (

گوتی :- (باشە، بەلام ئەوەی لە کۆلێژ فێری بوویت تیۆری بوو و کاری عەمەلی لێرە دەست پێدەکات کە کارێکی جیاوازە. (

ڕائد ڕایسپاردم گرنگیەکی تایبەت بدەمە ئەرکەکانی خۆم و تایبەتمەندی بارەگای (فەرمانگەی تایبەت لە ئەڵمانیای ڕۆژهەلات) کە ئەو ڕوونی کردەوەو بەم شێوەیە بەردەوام بوو لەسەر قسەکردن و گوتی:-

· کاری ئێوە بە پلەی یەکەم لە پێش هەموویانەوە ڕێگە گرتنە لە بەکارهێنانی هاوولاتیانی ڕووسی بۆ سیخوڕی کردن لەلایەن ئاژانسە سیخوڕییەکانی ڕۆژئاوا . ئەمەش نیزامی و غەیرە نیزامی دەگرێتەوە.

دووەمیان ئەگەر کەسێک پێشتر لەلایەن ئەو ئاژانسانەوە بەکارهێنرابوو بۆ سیخوڕی کردن دەبێ ئەو کەسە بدۆزنەوە و کارەکانی پووچەل بکەیتەوە.

سێ یەمیان ئەو کەسانەی دژی سۆڤیەتن واتە ئەوانەی دوژمنی دەسەلاتی سۆڤیەتن بە گەڕان بە دوایاندا بیاندۆزییەوە.

· چوارەم ماموورانی سیخوڕی ڕۆژئاوا کە لەناو هاوولاتیانی ئەلمانیای ڕۆژهەلاتدا هەن، واتە نزیک حەوزی مامووریەتی خۆتان دەبێ بیاندۆزییەوە.

ئێستا بۆ چارەسەری ئەم شتانە و وجێ بەجێ کردنی ئەم ئەرکانە پێویستیتان بە چی هەیە؟

وەلامم دایەوە :- تۆرێک لە ماموورانی باش کە زانیاری پێویست بگەیەننە من و (بۆیچنکۆف) قسەی منی بڕی گوتی :- (بە تەواوی ڕاستە . پێویستیتان بە مامووری زۆر هەیە) . پاشان زیاتر ڕوونی کردەوە و گوتی :- ئەو یەکانەی من بوومە لێپرسراویان بەهۆی کەمی کادیر ئەفسەری هەوالگری پیشوومان نەبوو، بۆیە هیچ ماموورێک لە خەلکی ڕووسی و ئەلمانیای ڕۆژهەلات بەکارنەخراوە . ئەم وەزعەش گیروگرفتی زۆری بۆ من دروست کرد . بەبێ هەبوونی سەرچاوەی نهێنی زانیاری ناچاربووم مامووری گونجاو پەیدا بکەم و بیانخەمە کار . ئەم کارەش ئاسان نەبوو.

)بۆیچنکۆف) بەم شێوەیە لەسەر قسە دلخۆشکەرەکانی خۆی بەردەوام بوو و گوتی :- (ئێوە دەبێ کاری خۆتان چالاکانە دەست پێ

بکەن و هەرچی زووترە تۆڕێک لە ماموران ڕێک بخەن . دەبێ لە ماوەی دوو مانگدا ١٠ مامور پەیدا بکەن. )

بە سەرسوڕمانەوە پرسیم :- (دوو مانگ)؟ ئەم کارە مەحاڵ بوو، چونکە پەیداکردنی ماموورێک سێ تا چوار مانگی کات پێویست بوو . بێگومان دەکرێ چوار یان پێنج کەس لە یەک کاتدا بەیەکەوە پەیدا بکرێن، بەڵام تا هەنگاوەکان دەگاتە کۆتایی پێنج تا شەش مانگی کات دەوێ . پەیداکردنی ١٠ مامور لە ماوەی دوو مانگدا بە مانای ژێر پێنانی هەموو تەعلیماتێکە.

ئەم شتانە بەم شێوەیە ڕاستەوخۆ بە ڕائد ووت، بەڵام قسەکانی من هیچ کاریگەرییەکی نەکردە سەر بۆچوون و بڕیارەکەی ئەو و گوتی :- بەڵێ، هەر وەک گوتم ١٠ مامور لە دوو مانگدا . لەم ماوەیەدا دەبێ سێ ئەفسەر دوو دەرەجەدار (عریف یا نائب چابگ) سەربازێک دوو نەفەر لە خێزانی ئەفسەران و دوو ئەڵمانی پەیدا بکەن.

ڕەخنەی دوایی من بەم پرسیارە کۆتایی پێهات :- ئایا دەزانی ئەم سێ پیتە (K.G.B) مانای چییە؟

گوتم :- بەڵێ قوربان یانی (کۆمیتەی ئاسایشی نەتەوەیی. )

گوتی :- نەخێر، (K.G.B)بە مانای (فەرمانگەی ڕێگرانی توندڕەو. (Kontora Grubykh Banditov –

هەر فەرمانبەرێکی (K.G.B) پاش دوو ساڵ کارکردن ئەم بابەتە هەست پێ دەکات . ئێمە دەبێ بەبێ ترس و بێ شەرمانە کاربکەین بە ئاگاداربوون لەسەر توانای خۆمان لە پاڵەپەستۆ خستنە سەر خەڵک درێغی نەکەین . بۆ ماموور پەیداکردن و خستنە کاریان نەک تەنها دەبێ ڕازیان بکەین، بەڵکو دەبێ ناچاریان بکەین کە بۆ ئێمە کار بکەن و بۆ ئەم مەبەستەش (K.G.B) توانا و دەسەڵاتی پێویستی

هەیە . ئەگەر ئەم خاڵە بەباشی پەیڕەو بکەن ئەو ئەرکەی بە ئێوەم سپاردووە دەتوانن بەباشی ئەنجامی بدەن.

پاشان نیو کاتژمێریتر لە .بارەی بەکارخستنی هاووڵاتیانی ڕووسی بەتایبەتی دەرەجەدارەکان واتە (عریف یا نائب چابگ) ەکان دواو گوتی :- کارێکی ئەوەندە گران نییە و هەر کەسێکی ڕووسی ئەگەر حەزیشی لێنەبێ دەتوانرێ بە زۆری وای لێبکرێت هاوکاریمان بکات . پاشان گوتی (K.G.B) -: دەسەڵات و توانای پێویستی ئەوەی هەیە ئەگەر کەسی دەست نیشان کراو ئەفسەر بێت پلە و پایە و شوێنەکەی دەخرێتە ژێر مەترسییەوە . (بەبێ ڕەزامەندی (K.G.B) هیچ ئەفسەرێک نانێردرێتە کۆلێژی چەنگ تا بتوانێ پلەکانی بەرزبوونەوەی (ترفیع) ی دوایی بەبێ ئاگاداری ئێمە بەرزبکرێتەوە) . بەکارخستنی دەرەجەدارە سادەکان لەوەش ئاسانترە و ئەوەندە بەسە لە سوپا دەربکرێن . هەروەها ژیانی هەر کەسێکی ڕووسی دەتوانرێ بخرێتە ژێر تۆقاندن و ترساندنەوە و لەوانەیە لە چوونە زانکۆ بێ بەش بکرێ یان کارەکەی لە دەست دەربهێنرێ یا ڕێگەی لە چوونە دەرەوەی وڵات لێدابخرێ.

)بۆیچنکۆف) بەردەوام بوو و گوتی :- (کەواتە ئەگەر کەڵک لە تواناو دەسەڵاتی خۆتان بە باشی و بە زانایی وەربگرن دەتوانن لە ماوەی دوو مانگدا ١٠ کەس پەیدا بکەن . لە بیرتان نەچێ ئێوە ئەفسەرێکی (K.G.B) ن هەموویان و هەموو کەس لە چوارچێوەی سنووری کاری ئێوەدان لە فەرماندەوە بگرە تا بێ دەسەڵاتترین سەربازی سادە بە شێوەیەک لە شێوەکان پەیوەندییان بە ئێوەوە هەیە . ئێوە ماموورێکی سەربەستن . کەواتە بەوپەڕی دڵنیاییەوە هەنگاو بنێن و لەکاتی پێویست لە کەڵک وەرگرتن لە بێ شەرمی و توندوتیژی کەمتەرخەمی مەکەن . ئێوە پارێزەری ڕژێمی ڕووسیان . توانای دەست نیشانکردنی دەسەڵاتی سیاسی خەڵکی ترتان هەیە . کەواتە چارەنووسی ئەوان لە دەستی ئێوەدایە . ئێستا هاوڕێ مولازم دەست بەکاربە بەو

مەرجەی بەرگری لە کارەکەی خۆتان بکەن . ڕژێمی ڕووسیا نزیکەی هەموو شتێکی بۆ تۆ ڕەواکردووە . لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەڵمانیای ڕۆژهەلات وولاتێکی سەربەخۆیە، بەلام ئێمەی فەرمانبەرانی (K.G.B) دەسەلاتی زۆرمان لەم وولاتەدا هەیە و نزیکەی دەتوانم بلێم وەک وولاتی خۆمان ڕووسیا دەتوانین کاری تێدا بکەین.

)بۆیچنکۆف) پاشان لە سندوقە ئاسنییەکەی ژوورەکەی بەلگەنامەیەکی دەرهێنا کە ناوەڕۆکەکەی بریتی بوو لە ڕێککەوتننامە نهێنییەکەی بەینی ئەڵمانیای ڕۆژهەلات و ڕووسیا . بە پێی ئەم بەلگەنامەیە (K.G.B) ئەم دەسەلاتانەی خوارەوەی لە ئەڵمانیای ڕۆژهەلات هەیە-:

- مافی ئەوەی هەیە لەناو خەڵکی ئەڵمانیادا چالاکی بکەن بۆ دۆزینەوەی ئاژانسە سیخوڕییەکانی ڕۆژئاوا یان کەسانی دژە ڕووسی و دژە نەتەوەیی.

مافی ئەوەی هەیە کەلک لە هاوولاتیانی ئەڵمانیای ڕۆژهەلات وەربگرێ بۆ سیخوڕیکردن لە وولاتە ڕۆژئاواییەکانی وەک (ئەڵمانیای ڕۆژئاوا، ئەمریکا، بریتانیا، فەڕەنسا و . هتد.(

دەتوانێ ئەوانەی لە وولاتە سەرمایەدارەکانەوە بەسەفەر دێنە ئەڵمانیای ڕۆژهەلات بۆ کاری سیخوڕی کردن بەکاریان بهێنن و دایانبمەزرێنن.

- ڕێگایان پێدراوە خانوو یان باڵەخانەیان لەژێر دەسەلاتدا بێت بۆ کاری پیلان گێران و داڕشتنی هەر بەرنامەیەک.

دەتوانێت زۆر چالاکانە لەگەڵ وەزارەتی ئاسایشی ئەڵمانیای ڕۆژهەلات هاوکاری بکات و لەکاتی پێویست دۆسیەکان تەماشا بکات.

- وەزارەتی ئاسایشی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات لەسەر داوای (K.G.B)نامە و نووسراوەکانیتری هاووڵاتیانی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات دەکاتەوە.

- ڕێگای پێدراوە دۆسیەکانی پۆلیسی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات تەماشا بکات و هەروەها پۆلیس هاوکاری و پشتیوانی چالاکانەی لێدەکات.

له کۆتایی ئەم ڕێککەوتننامەیەدا نووسرابوو پێویستە لەسەر ئەفسەرانی (K.G.B) سەبارەت بە لێپرسراوانی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات بە ئەدەب و ڕێزیان لێ بگیرێت کە بێگومان ئەم بەشەیان جگە لە موجامەلەکردن و ڕووالەتی شتێکی تر نەبوو.

لە بارەی ماموورە ئەڵمانییەکان (بۆیچنکۆف) گوتی :- ئەڵمانییەکی باش وەک هاووڵاتیەکی ڕووسی وایە . ئەویش دەیەوێ بژی و خۆی لە زەحمەت و دەردەسەر دوور دەخاتەوە . هەمان ئەو ڕێگایانەی کە سەبارەت بە هاووڵاتیەکی ڕووسی بۆتان باس کراوە لەسەر ئەڵمانییەکانیش جێ بەجێ دەکرێن . ئەگەر بکرێ بە ئارەزوو و مەیلی خۆی ئەگەرنا بە زۆر.

پاشان گوتی :- هەندێ جار دامەزراندنی ئەڵمانییەک ئاسانترە لە ڕووسییەک . ئەوان میللەتێکی گوێڕایەڵ و ڕێک و پێکن و دەسەڵاتیان خۆش دەوێ بۆیە لە کاتی بەکارخستنیان بە دڵنیاییەوە کاربکەن و دەسەلات توانای خۆمانیان پێشان بدەن . ئەمە ڕێگایەکی کاریگەرە.

ڕائد گوتی :- لە سەرەتادا هەموو ڕۆژێ یەکتر دەبینین . پاشان بۆ یەکتر ناسین منی ناردە لای جێگرەکەی کە ناوی (ڕائد کریکۆف) و لەو بە تەمەنتر بوو.

کاتێ چوومە ژووری (ڕائد کریڤکۆف) بە پیاوێکی زیرەک و خۆش ڕەفتار کەوتە بەر چاوم و لە چاوەکانی ڕا دیار بوو زۆر عاشقی مەی خواردنەوە بوو.

زۆربەی مامورە ڕووسییەکان لە دەرەوەی وڵات لەکاتی بێکاریدا لەگەڵ بوتلی مەی (مشروب) کات دەگوزەرێنن . ئاماری مەسرەفی خواردنەوە کحولییەکان لە یەکێتیی سۆڤیەت لەهەر هەموو وولاتانی تری جیهان زیاترە.

)ڕائد کریڤکۆف) مرۆڤێکی بیرۆکراتی گوێڕایەڵ بوو . خۆی بە (ڕائد ئەلکسەندەر گراسیمڤیچ کریڤکۆف) بە من ناساند و گوتی :- فەرموون دانیشن . پاشان گوتی :

- کە بۆ نیشتەجێ بوونی من لە ئەڵمانیای ڕۆژهەلات خانوویەک دەست نیشان کراوە و لە ماوەی یەک دوو ڕۆژێتر کارەکانی تری من ڕێک دەخرێن.

ڕائد بۆ شارەزاکردن و بۆ ئەوەی من بەو شوێنە بناسێنێ کە کاری تێد دەکەم بە کورتی باسێکی فەرمانگەکە و لەسەر شێوەی کاری ئەوێ قسەی بۆ کردم و گوتی :- بە گشتی ١٧ کەس لەم فەرمانگەیە کاردەکەن . پاشان منی نارده لای سکرتێرەکەی خۆی بۆ وەرگرتنی پێناسەی ناسین ئەو شتانەی کە پێویستن لەگەڵ کلیلی مێز و ژووری کارو قاسە بۆ ئەوەی بەرامبەر بە پسوولە (رصید) وەریان بگرم.

پاش ئەنجامدانی ئەم کارانە سەرەنجام خۆم لەناو هاوکارە تازەکانم دۆزییەوە پاش خۆ بەیەکتر ناساندن ناچار بووم وەلامی زۆر پرسیاری ئەوان بدەمەوە، چونکە زۆربەی هاوکارە تازەکانم ماوەیەک بوو لە وولات دوور بوون.

نزیکەی کاتژمێرێک دواتر (بایکۆف) هاتەوە کە بۆ ئەنجامدانی ماموورییەتێکی کورت فەرمانگەکەی بەجێ هێشتبوو . کاری ئەو لە یەکەیەک (وحدە) بوو کە دەکەوتە چل کیلۆمەتری (برنۆ. (

لە کۆتایی ئەو ڕۆژەدا من و (داڤیدۆف) بەیەکەوە بەرەو لای خانووەکەم بەڕێکەوتین . لە ڕێگادا سەبارەت بە گفتوگۆکانم لەگەڵ (ڕائد بۆیچنکۆف) ی سەرۆکی فەرمانگەی (K.G.B) پرسیاری لێکردم . کاتێ پێم ووت کە سەرۆکی فەرمانگە داوای لە من کردووە کە لە ماوەی دوو مانگدا ١٠ ماموور پەیدا بکەم لە دڵەوە پێکەنی و گوتی :- ڕێگای ڕاستی فێرکردنی کار بە ئێوە گەنجان ئەوەیە . سەرۆک کاری خۆی باش دەزانێ.

(داڤیدۆف) بەدوای ئەمەدا گوتی کە دڵگیر نەبم، چونکە سەرۆک هەمیشە زۆر داوا دەکات تا ماموورەکان والێ بکات کە چالاکانە کاربکەن . ئەوە ڕەوشتی ئەوە . بەڵام ئەگەر بتوانم دوو کەسیش پەیدا بکەم سەرۆک خۆشحاڵ دەبێت.

ئەو شەوە (داڤیدۆف) لای من مایەوە و ئێمە سەرگەرمی قسە و گفتوگۆ بووین . (داڤیدۆف) لەسەر کەرەوێتەیەک دانیشتبوو و جگەرەی بەرگی دەکێشا . هەستم کرد کە کحول بەتەواوی وەزعی ئەوی گۆڕیوە بەشێوەیەک کە هەندێ بابەتی دەدرکاند و باسی دەکرد کە لەلایەنی هەواڵگری و ئاساییشەوە مەترسیدار و نابێ بەو بێ پەردەییەوە لە بارەی ئەوانەوە گفتوگۆ بکرێ . پاش پەرداغی سێ یەم پێشنیاری کرد کە لە جیاتی بەکارهێنانی ووشەی (ئێوە) با یەکتر بە (تۆ) بانگ بکەین، چونکە ئەمە دۆستانەترە.

پاش ئەمە بە ماوەیەکی کەم (داڤیدۆف) دەستی کرد بە باسکردنی وەزعی فەرمانگە و گوتی :- فەرمانگەکەمان لە ڕاستیدا خاوەنی دوو لێپرسراوە . هەمیشە شەڕ لەمابەینی (ڕائد بۆیچنکۆف) و

جێگرەکەی (ڕائد کریڤکۆف) بەردەوامە . (بۆیچنکۆف) نزیکەی گەنج و چالاک و ڕوحیەتی بەرزەفڕی هەیە بۆ گەیشتن بە پلە بەرزەکانی (K.G.B)و ئەمەش نایەتەدی مەگەر ئەندامەکانی ئەم فەرمانگەیە بە زیرەکی و چالاکانە دوژمنانی وولات پەیدا نەکەن و پیلانەکانیان پووچەڵ نەکەنەوە . سەرکەوتن پەیوەندی ڕاستەوخۆی هەیە بە ئاستی دۆزینەوەی ژمارەی سیخوڕانی دوژمن و مامووڕانی وولاتە ڕۆژئاواییەکان کە دژی سۆڤیەتن.

)بۆیچنکۆف) بۆ گەیشتن بەم مەبەستە لە هیچ هەوڵ و کۆششێک درێغی ناکات . لە ڕێگای دەرکردنی فەرمان ووتەکانی ڕاهێنانی (مەشق) سزادان و سوپاسکردن دانانی نەخشە تازەکان هەوڵدەدات خۆی پیشان بدات . بەرنامەی ڕفاندنی کڵاوە ئەتۆمییەکە لە بارەگای (دۆسڵدۆرف) لەلایەن ئەوەوە داڕێژرا و بۆ بەڕێوەبەرایەتی ناوەندی لە مۆسکۆ پێشنیارکراو بە سەرکەوتوویی ئەنجام درا.

دزینی کڵاوە ئەتۆمییەکەی مووشەکەکانی ئەمریکی جێگیر لە ئەڵمانیای ڕۆژئاوا کە لە دەیەی ۱۹۷۰ ڕوویدا ئاژاوەیەکی گەورەی لە جیهاندا دروست کرد کە نە پۆلیسی ئەڵمانیای ڕۆژئاوا و تەنانەت مامووڕە ئەمریکییەکان و دەزگا سیخوڕی و زانیارییەکانی ئەم دوو وولاتە خاوەن سوودە هاوبەشە نەیانتوانی شوێنەوارێک لە ڕفێنەران بەدی بکەن . یەکێکە لە سەرکەوتنە گەورەکانی (K.G.B) بۆ بەدەست هێنانی زانیاری لەسەر تەکنەلۆجیای نیزامی ڕۆژئاوا . هەروەها لەم شێوە چالاکییانەش ڕفاندنی کۆمپیوتەرەکانی ئەمریکایی ئەنجام دراوە.

داوام لە (داڤیدۆف) کرد کە ڕووداوی ڕفاندنی کڵاوە ئەتۆمییەکەی بارەگای (دۆسڵدۆرف)م بۆ باس بکات . دەمزانی کە (داڤیدۆف) بەهۆی بەشداری لەم چالاکییەدا پلەی بەرزکراوەتەوە و ئێستاش کە مەی کاریگەری خۆی کردووە ئەگەر بۆ خۆ هەڵکێشانیش

بێت ئەم ڕووداوە گەورەیەی سەدە (قرن) کە لەناو (K.G.B) کەس زانیاری تەواوی لەسەر نییە بۆم باس دەکات.

)داڤیدۆف) لە کاتێکدا قومێکی توندی لەماوەی جگەرە بەرگیەکەی دەستی دا و گوتی :- ئەلیکس چۆن تۆ زانیاریت نیە لەسەر ڕووداوی (دۆسلدۆرف)؟

گوتم :- ئەوەندەش بێ ئاگانیم، بەلام دەمەوێ لە زمانی خۆتانەوە گوێم لێبێ کە قارەمانی ئەم ڕووداوە گەورەیەن داستانەکە ببیستم.

بەکاربردنی وشەی (قارەمان) بووە هۆی جوولاندنی زیاتری (داڤیدۆف. (

)داڤیدۆف) گوتی :- کاتێ کە (ڕائد بۆیچنکۆف) من و چوار ئەفسەرەکەی کە لە مۆسکۆوە هاتبوون لەسەر پلانی خۆی ئاگادار کردین من وای بۆ دەچووم کە شێت بووە یان مەبەستیەتی جیهان بەرەو شەڕێکی ماڵوێرانکەر ببات.

)بۆیچنکۆف) زۆر بە ئاسانی و خوێن ساردییەوە گوتی :- هاوڕێیتم ئێمە لێرە کۆبووینەتەوە تا پلانی دزینی دوو کڵاوەی ئەتۆمی لە بارەگای مووشەکی (دۆسڵدۆرف) تاوتوێ بکەین.

من گوتم : هاوڕێ ڕائد، بەڕاستیتە؟

چوار ماموورەکەی کە لە (مۆسکۆ) وە هاتبوون دیاربوو پێشتر ئاگاداریان لەسەر ئەم چالاکییە هەبوو بۆیە بچووکترین سەرسوڕمانیان لەخۆیان نیشان نەدا.

)بۆیچنکۆف) بەردەوام بوو و گوتی :- کارێکی زۆر سادە و ئاسان خراوەتە ئەستۆی ئێوە . ئێوە بە دوو سەیارەی (نەتەوە

یەکگرتووەکان (UN – دەچنە بارەگای مووشەکی (دۆسلدۆرف) و دوو کڵاوەی ئەتۆمی دەخەنە ناو سندوقی پشتەوەی سەیارەکان و دەگەڕێنەوە . (ڕائد بۆیچنکۆف) پاشان دەستی کرد بە باس کردنی چالاکییەکە .

دزینی کڵاوە ئەتۆمییەکەی مووشەکی پۆزیدۆن

لە ٢٢ی شوباتدا بڕیار بوو شاندەکێکی چوار کەسی لە (نەتەوە یەکگرتووەکان (UN – سەردانی بنکەکانی مووشەکی جێگیر لە ئەڵمانیای ڕۆژئاوا و بکا و بە ڕاپۆرتێک لە ئەنجامی سەردانەکەیان سکرتێری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان ئاگادار بکەن . پاش ئەوەی مووشەکی چەند تیری (پیکانە)، (پۆزیدۆن) لەلایەن وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە ئەڵمانیای ڕۆژئاوا بەکارهات زانا رووسەکان بە گەرمی هەوڵیان دەدا بۆ گەیاندنی یەکێتیی سۆڤیەت بە ئاستی هێزەکانی ئەمەریکا و هاوپەیمانەکانی لە ئەورووپای ڕۆژئاوا چەکێک دروست بکەن کە بتوانێ لەبەرامبەر مووشەکە چەند تیرییەکەی (پۆزیدۆن) بوەستێ، بەڵام بۆ دووەم ساڵ لەسەر یەک لەم بوارەدا هەوڵەکانیان ئاکامی نەبوو . ئاشکرا نییە کە ئەکادیمییەکان پەیوەندییان بە (K.G.B) یەوە کردووە یان (مەکتەبی سیاسی) دەستووری دابووە (K.G.B)هاوکاری ئەکادیمییەکان بکات و هەوڵ بدرێ زانیاری و نهێنی مووشەکەکانی (پۆزیدۆن) بخرێتە ژێر دەستی زانا ڕووسەکان . ئەوەی ڕوونە ئەوەیە دوو ساڵ پاشکەوتن لە زۆرانبازی چەکدارێتی بۆ ڕووسەکان بە گران تەواو دەبوو و بە دزینی چەند نموونەیەکی لەم کڵاوە ئەتۆمییانەی مووشەکەکانی (پۆزیدۆن) دەتوانرا نهێنییەکانی ئەم چەکە بخرێتە ژێر دەستی زانا ڕووسەکان.

لەگەڵ هەوڵی زانا نیزامییە ڕووسەکان بۆ دروست کردنی چەکێکی وەک ئەو بۆ جێگیرکردنی لە ئەورووپای ڕۆژهەڵات، دەوڵەتی

ڕووسیا بە هەوڵە دبلۆماسی و پڕوپاگەندەییەکانی خۆی توانی ((UN)
ناچار بکات تا لە بابەت جێگیرکردنی چەکە تازەکانی ئەمریکا لە ئەوروپای ڕۆژئاوا دەست بداتە لێکۆڵینەوە . گەرچی نەتەوە یەکگرتووەکان ناتوانێ کارێکی ئیجابی هەبێ لەسەر گۆڕینی ئەم چەکانە لەگەڵ ئەوەشدا لە هەڵوێستێکی شانۆییانەدا سکرتێری نەتەوە یەکگرتووەکان کە لە دوا مانگەکانی کۆتایی هاتنی مامووریەتەکەی دابوو بۆ دروست بوونی بارودۆخێکی تایبەت و سوود بەخش بۆ دووبارە هەڵبژاردنەوەی بە سکرتێری گشتی ئەم ڕێکخراوە ڕەزامەندیدا بە ناردنی شاندەکێک کە پێک هاتبوو لە چوار پسپۆڕی کاروباری نیزامی بۆ سەردانی شوێنی جێگیر بوونی ئەم جۆرە چەکانە بنیردرێت بۆ ئەڵمانیای ڕۆژئاوا.

لەو کاتەوەی ئەم مامووریەتە ڕەزامەندی لەسەر دراو لە (ئەنجومەنی ئاسایش) باسی لێوە کرا (K.G.B) کە لە پێشتر خۆی بۆ ئەم کارە ئامادە کردبوو و بۆ گەیشتن بە مەبەستەکانی کە ئەویش دزینی کڵاوە ئەتۆمییەکەی مووشەکی پۆزیدۆن بوو دەستی دایە چالاکییەکی فراوان لەم مەیدانەدا.

(K.G.B)ئاگاداربوو لەسەر ئەوەی کە ئەم شاندەکە پێکهاتووە لە پسپۆڕێکی سویدی بەناوی (ئەدۆلف زیگفرید) پسپۆڕێکی هۆڵەندی بەناوی (هلمۆت ڤیت) و دوو پسپۆڕی یۆنانی بە ناوەکانی (کۆنستانتین ئاندر) و (ئەرستۆ پاپاندریاس. )

(K.G.B)بە پەلە کەوتە کار بۆ دۆزینەوەی چوار کەس لەنێو هەزاران کەس لە ماموورانی پسپۆڕ و لێهاتووی خۆی کە لە ڕووی بەیەک چوونەوە نزیک بن لە چوار کەسی شاندەکەی (UN) کە منیش واتە (داڤیدۆف) لەبەر ئەوەی زۆر بە (هلمۆت ڤیت) دەچووم و شارەزاییەکی باشم لە زمانی هۆڵەندی هەبوو هەڵبژێردرام بۆ بەشدار

لەم ماموریەتەدا . سێ نەفەرەکەی تریش کە لە مۆسکۆوە هاتبوون سەرەڕای ئەوەی لەڕووی وێکچوونەوە بە ئەندامەکانیتری شاندەکەی (UN)ڕەچاو کرابوو لە ڕووی زمانیشەوە شارەزایی تەواویان لەسەر زمانی یۆنانی و سویدی هەبوو و (کۆریچکین) و (زاخاریف) بۆ ساڵانێکی زۆر لە بواری کاری سیخوڕی کردندا لە یۆنان کاریان کردبوو.

کارتی پێناسەی نادیار و بەڵگەنامەی کەسایەتی دروست کراو (تەزویر) لە (مۆسکۆ) لە تاقیگە تایبەتییەکەی بەڕێوەبەرایەتی ناوەندی (K.G.B)پێشتر بۆمان ئامادە کرابوون.

هەندێ گۆڕانکاریش لەسەر دەم و چاوی (کۆریچکین) کرابوو . وێکچوونەکان بە شێوەیەکی زۆر وورد ڕەچاوکرابوون تا ماموورەکانی ئاسایشی ئەمریکایی لە بنکەی (دۆسلدۆرف) بەتەواوی تووشی هەڵە ببن . چاودێری ئاسایشی لە بنکە مووشەکییەکانی جێگیر لەسەر خاکی ئەڵمانیا بە ڕاددەیەک بە ووردی ڕەچاو دەکرێت کە شاندەکی ماموورانی (UN)پێشتر وێنە و پێناسەی کەسایەتییان بە شێوەیەکی تەواو دەدرێتە فەرماندەیی (ناتۆ) لە ئەڵمانیای ڕۆژئاوا و ئەویش دەیداتە پارێزەری ئاسایشی ئەم بنکانەی کە لەلایەن شاندەکی ناوبراوەوە سەردانیان دەکرێت.

)بۆیچنکۆف) ئەوەی پێویست بوو لە ئەڵمانیای ڕۆژئاوا ئەنجامی دابوو . ئێمە بەپێی بەرنامەی داڕێژراوی پێشوو لەگەڵ خودی بۆیچنکۆف) بەناوی هاوولاتیانی (بولغاری) و (یۆغسلافی) بۆ گەشت و گوزار لەژێر ناوی توریست بە بەڵگەنامەی دروست کراو (تەزویر) دەچووینە ئەڵمانیای ڕۆژئاوا . پاش دابەزین لە هۆتێل پێنج ماموری تری (K.G.B) بە سیفاتە وێکچووەکان و بەڵگەنامەکانی ئێمە جێگای ئێمەیان دەگرتەوە بۆ ئەوەی وونبوونی لە ناکاوی ئێمە لەسەر خاکی

ئەڵمانیای ڕۆژئاوا سەرنجی کەس ڕانەکێشێ . پاش ئەمە دەبوایە بچینە خانوویەک کە کەوتبووە شەقامی (داخۆشتراوس) کە خاوەنەکەی یەکێک لە ماموورە خۆ جێیەکانی (K.G.B) یە.

چل و هەشت کاتژمێر پێش ئەوەی بەرنامەکە دەست پێ بکات هەمووومان سەرکەوتوانە هەنگاوی یەکەمی بەرنامەی دزینی کڵاوە ئەتۆمییەکانمان جێ بەجێ کرد و هەمووومان لەماڵی (شمیت بۆت) کە ماموورێکی ئەڵمانی (K.G.B) بوو و ماڵەکەی دەکەوتە شەقامی (داخۆشتراوس) و لە بابەت بەرنامەی بەیانی گفتوگۆمان دەکرد . تا ماوەیەک پێش ئێمە پێنج توریست بووین خەڵکی (بولغاریا) و (یۆغسلافیا) کە دروستکراوەکانی ئێمە کە لامان بوون هەموو شک و گومانێکی لەسەر ئێمە وەلادەبرد . پێناسە و بەڵگەنامەکانمان ئێستا داوەتە پێنج مامووری جێگەگری خۆمان و ئێمەش بەبێ هەموو بەڵگەنامەیەکی پێناسەی کەسایەتی کە بتوانین نیشانی بدەی لەناو خاکی ئەڵمانیای ڕۆژئاوا نیشتەجێ بووینە.

)شمیت بۆت) پەردەی ماڵەکەی بەتەواوی هێنابووە خوارەوە بۆ ئەوەی لە دەرەوە ژوورەوەی خانووەکە نەبینرێ . ترس و دوو دڵی و شپرزەییەکی زۆر باڵی کێشا بوو بەسەرمانداو ئێمەی ئازار دەدا.

دیکۆری ماڵەکەی (شمیت بۆت) نزیکەی جوان بوو و ئەمەش نیشانی ئەوەی دەدا کە وەزعی ماڵی خاوەن ماڵ باشە . ماموورانی خۆجێ یی (K.G.B) لە سەرتاسەری جیهاندا بڵاون و ئەمەش باشترین یارمەتیدەری چالاکی و مامووریەتەکانن لە دەرەوەی سنووری وڵات . قەفەسە پڕ لە کتێبەکان لەو جێگایەی ئێمە لێی دانیشتووین ئەوەی نیشان دەدا کە خاوەن ماڵ بە جۆرێک لە جۆرەکان پەیوەندی بە کتێب و خوێندنەوە و بڵاوکراوەکانەوە هەیە . لە بۆچوونەکەمدا هەڵە نەبووم، چونکە پاش یەکتر ناسین بۆم دەرکەوت کە (مستەر شمیت) نووسەری

ڕۆژنامەی (زودڤیچە زایتونگ) ە (K.G.B) . سیخوڕی زۆری لەناو ڕۆژنامەنووسان لە سەرتاسەری جیهاندا هەیە . ئەمانە دەتوانن کاربکەنە سەر ئەو بابەتانەی چاپ دەکرێن . هەوڵ و چالاکی دەنوێنن ئەو بابەتانە بە چاپ بگەیەنن کە یەکێتیی سۆڤیەت مەبەستیەتی و بواری بیرو بۆچوونی چەپگەرایی پێوە دیارە و لە بەرامبەر ئەمەشدا ئەمانە مووچە و پاداشتی بێ وێنە لە (K.G.B) وەردەگرن . تەنانەت لە زۆر لە وولاتانی جیهان زۆر لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکان بە بودجە و پارە یان بەلانی کەمەوە بە هاوکاری (K.G.B) بڵاودەکرێنەوە . بێگومان ئەمەش تایبەت نییە بە یەکێتیی سۆڤیەت، بەڵکو ئەمریکاییەکانیش لە ئاستێکی بەرز و فراواندا ڕۆژنامە و گۆڤار و دام و دەزگا پەیوەندییەکانی دۆستی خۆی هاوکاریان دەکا و یارمەتی ماڵییان دەداتێ . یا بە دیاری ماڵی زۆر سەخیانە هەوڵدەدەن لە ڕاست پڕوپاگەندەکردن بە سوودی ئەمریکا دڵگەرمیان بکەن.

)بۆیچنکۆف) گوتی :- لەماوەی ئەم ٤٨ کاتژمێرەی دادێت واتە تا دەست پێکردنی چالاکییەکە کەس نابێت لەم ماڵە بچێتە دەرەوە . هاتنە ژوورەوەی ئێمە بۆ ئەم ماڵە بەنهێنی و بەبێ ئاگاداری خەڵک و ماموورانەوە بووە و ئەم خۆشاردنەوەش دەبێ بپارێزرێ، چونکە لەوانەیە تەنها ئاشکرابوونی ئێمە لەم شوێنەدا بەسە بۆ لەبەین بردنی هەموو ئەو هەوڵ و کۆششەی لە ماوەی دوو ساڵی ڕابردوودا لە (مۆسکۆ) کاری لەسەر کراوە.

ڕستەی کۆتایی (بۆیچنکۆف) تەواو نەببوو کە زەنگی دەرگای ماڵی (مستەر شمیت بۆت) کە خانەخوێی ئەڵمانی و لە ڕاستیدا هاوکارە ئەڵمانییەکەی ئێمە بوو لێدرا . ترس و دڵەڕاوکێ بە ڕوونی لە چاوی هەمووماندا دەبینرا . دەنگی زەنگەکە بە بەردەوامی دەهاتە بەرگوێ . لەم کاتانەدا دەکرێ هەر جۆرە پەشۆکاوییەک لە جێگای خۆیدا نەبێت و ئەوە نەبێت کە بیری لێدەکرێتەوە . لەوانەیە پۆستەچی بێت یان کەسێکی

گەڕۆک بێت بۆ بڵاوکردنەوەی نموونەیەک لە بەرهەمی کارخانەیەک کە بەخۆڕایی دەیبەخشی بە خەڵک زەنگ لێیدات، بەڵام لەبەر ئەوەی مامووریەتێکی گەورە لە پێشە و کۆمەڵێک بە قاچاخ و بەبێ یاسایی لە وولاتێکدان بێ گومان بە هیچ شێوەیەک ناتوانرێت شپرزەیی و دڵەڕاوکێ بوون نادیدە بگیرێت.

)بۆیچنکۆف) رووی لە (مستەر شمیت) کرد و ئەویش بێ ئەوەی چاوەڕێی پرسیارێک بکات گوتی :- من بۆ ماوەی هەفتەیەک مۆڵەتم لە ڕۆژنامە وەرگرتووە و هەموو هاوکارەکانم وادەزانن بۆ سەردانی دیکم چوومە بۆ (بۆن) . لەگەڵ جیرانەکانیشم ئەوەندە پەیوەندیم نییە و خێزانیشم بۆ سەردانی خزمەکانی چووەتە (باڤاریا) . پاشان بەبێ ئەوەی چاوەڕێی وەلامی قسەکانی خۆی بێت هەستا سەرپێ و ڕێگای نهۆمی خوارەوەی گرتەبەر و گوتی :- بەهەر حاڵ چارە نییە دەبێ دەرگا بکەمەوە لەوانەیە نەکردنەوەی ببێتە هۆی پەیداکردنی نارەحەتییەکی جددی.

هیچ یەک لە ئێمە چەکدار نەبووین . تەنانەت من وا بە خەیاڵم داهات کە (شمیت) پێشتر هاتنی ئێمەی ئاگاداری مامووڕانی ئاسایشی ئەڵمانیای ڕۆژئاوا کردبێ و ئەوان بۆ گرتنی ئێمە هاتبن . کەڵک وەرگرتن لە ماوورە خۆ جێییەکان لەوانەیە هەمیشە ئەم جۆرە کارانەی تێبکەوی . ئەوان لە سەودایەکی دوولایەنە لە کاتێک دا بۆ ساڵانێکی زۆر مووچەخۆری (K.G.B) بوونە لەوانەیە لە دەرفەتێکی گونجاودا تۆڕێک یا مامووریەتێک و یان چالاکییەک ئاشکرا بکەن و بۆ هەمیشە خۆیان دوور بخەنەوە.

نیگەرانی و ترس بە ئاشکرایی لە چاوەکانی (بۆیچنکۆف) بەدی دەکرا . دەرگا بە دەنگێکی ووشک و نەرم لەسەر پانیەکەی کرایەوە و دەنگی نارەزایی ژنێک دەهاتە بەرگوێ کە بە لەهجەی (باڤاریا) قسەی

لەگەڵ (شمیت) دەکرد و ئەویش هەوڵی دەدا ڕێگا لە هاتنە ژوورەوەی ژنەکە بگرێ کە هەوڵدانەکەی بێهودە بوو و لە دواییدا بۆمان دەرکەوت کە خێزانیەتی.

خێزانی (شمیت) کەوا بە خەیاڵی داهاتبوو کە مێردەکەی سەرگەرمی ڕابواردنە لەگەڵ ژنێکی تردا لەماڵەکەی ئەودا بۆیە بەتوندی بۆ پشکنینی ماڵەکە هاتە سەرەوە و کاتێک چاوی بە ئێمەی تووڕە و ڕووگرژ بەتەواوی ساردبۆوە و سەرسوڕماوو واقوڕماو لە شوێنی خۆی بە بێ جوولە وەستابوو.

بەدوای (ئالگا) مێردەکەشی (شمیت) هاتە سەرەوە و بۆ (بۆیچنکۆف) ڕوونی کردەوە و گوتی :- بۆ میوانداری ئێمە و بەشداری لەم چالاکییەدا خێزانەکەی بۆ ماوەیەک ناردبووە (باڤاریا) لای خزمەکانی، بەڵام خێزانەکەی بە پێی قسەکانی خۆی لەو گومانی پەیداکردوە و بۆ ئاگاداری لەسەر ئەوەی لە غیابی ئەودا چی لە ماڵەوە ڕوودەدات بەبێ ئاگاداری و لە پڕێکا گەڕاوەتەوە (دۆسلدۆرف. (

)بۆیچنکۆف) گوتی :- چارە نیە ئێستا کە خێزانت هاتۆتەوە دەبێ ئەوە بزانێ لە ماوەی لێرە بوونی ئێمەدا نابێ لە ماڵ بچێتە دەرەوە . نامەوێت بەهۆی گیروگرفتی خێزانی گێلانە و ژنانە بەرنامەیەکی وا گەورە لەدەست بدەین و پووچەڵ بێتەوە.

)ئالگا و شمیت) چوونە نهۆمی خوارەوە . من سەبارەت بە دڵنیابوون لە (شمیت) و (بۆیچنکۆف) پرسیارم کرد و ئەویش گوتی :- جێگای نیگەرانی نییە . لیستی ئەو پارانەی تا ئێستا لە ئێمەی وەرگرتووە هەموویان بە ئیمزای خۆیەتی لەکاتی خیانەت کردنیدا لە ڕاستیدا بەڵگەنامەی مردنی خۆی ئیمزا کردووە . پاشان گوتی :- ئەو ڕۆژنامەنووسێکی بەهۆشە و پەیوەندییەکی تایبەتی بە وڵاتە

سۆشیالیستەکانەوە هەیە و تا ئێستاش چەندین مامووریەتی لە ڤێتنام و کوبا ئەنجام داوە.

پاشان (کۆریچکین) داوای لە (بۆیچنکوف) کرد تا جارەکیتر نەخشەی چۆنیەتی چوونە ژوورەوەی بنکەکە و ئەنجامدانی چالاکییەکە باسی لێوە بکرێتەوە.

)بۆیچنکۆف) دەستی کرد بە باسکردنی بەرنامەکە و گوتی :-
دوو سەیارەی نووسینگەی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لە (بۆن) بۆ بردنی شاندەکی سیاسی نیزامی (UN) دێنە فرۆکەخانە . ئەنجامدانی شاندەکەکە ڕاستەوخۆ لە نیۆیۆرکەوە دێن بۆ (بۆن) و لە سالۆنی ترانزێتی فڕۆکەخانە لەلایەن گروپێکی تر کە لە (مۆسکۆ) وە لە بەڕێوەبەرایەتی (K.G.B) یەوە هاتوون ئەندامانی شاندەکە دەبەنە دەرەوەی فڕۆکەخانە و ئێمە کە لە سالۆنی فڕۆکەخانەکە خۆمان شاردۆتەوە جێگای ئەوان دەگرینەوە . کاتێ کە سەیارەکانی (UN) دێن بۆ بردنیان ئێمە دەبینن و ئێمە سواری سەیارەکان دەبین لەگەڵ مامووەرانی ئاسایشی ئەڵمانیا ڕاستەوخۆ دەچینە ژوورەوەی بنکەی هەوایی (دۆسلدۆرف) . لەوێش فەرماندەی بنکەکە پێشوازیمان لێدەکا و پاش گەڕانێکی کورت لەناو بنکەکەدا دەچین بۆ تەماشاکردنی سایلۆکان

)داڤیدۆف) هەروا قسەی دەکرد . مەی خواردنەوەکەی خەیاڵی کردبوو و لە پەل و پۆی بردبوو . ئەو ڕووداوەی ئەو باسی بۆ دەکردم یەکێک بوو لە گەورەترین چالاکییەکانی سیخوڕی کە (K.G.B) ئەنجامی دابوو . چالاکییەکی زۆر فراوان و زۆر گرنگ، بەڵام ئێستا کە (داڤیدۆف) بۆم باس دەکات دەبینم زۆر لە وردەکارییەکانی چالاکییەکە نەک بەهۆی ئاڵۆزی و فراوانی چالاکییەکە و ئەزموونی (K.G.B) بووە، بەڵکو بەهۆی لاوازی ئاسایشی دوژمن بووە لەم شوێنانەدا . دزینی کڵاوە

ئەتۆمییەکەی (پۆزیدۆن) بەم شێوەیە و بەم کارە منداڵانەییە کە وەک فلیمێکی پۆلیسی تەلەفزیۆن دێتە بەرچاو نیشانەی لاوازی ئاسایشی دوژمنە بەجۆرێک فەرماندە ئەمریکاییەکەی بنکەکە بێ ئەوەی ویستبی گەورەترین هاوکاری مامووارانی (K.G.B) کردوە بۆ دزینی ئەم کڵاوە ئەتۆمییە.

22ی شوباتی دەستەیکیتر لە مامووارانی خاوەن ئەزموون بەڕێوەبەرایەتی ناوەندی (K.G.B) کە لە (مۆسکۆ) وە پێشتر چووبوون بۆ نیۆیۆرک دەتوانن لە هەمان فڕۆکەدا کە شاندەکی (UN) دەبات بۆ (بۆن) جێگا بۆ خۆیان پەیدا بکەن و لەگەڵ ئەواندا سەفەر بکەن . ئەم دەستەیە لە کاتێکدا فڕۆکەکە ناچار دەبێت بۆ ماوەیەک لە فڕۆکەخانە بگەنە (بۆن) هەر لە هەمان فڕۆکەخانەی (ئەپینا) ناچاریان دەکەن لەگەڵیان بچن و باش پاش تێپەڕبووین ٢٤ کاتژمێر بەسەر چالاکییەکەدا بەبێ ئەوەی ئازارێکیان پێ بگات لە یۆنان ئازاد کران . من لە چۆنیەتی ڕفاندنی ئەم چوار پسپۆرە ئاگادار نییم، بەڵام دڵنیام ئەگەر ئەم کارە لە یۆنان ئەنجام نەدرابا و گەیشتبانە فڕۆکەخانەی (بۆن) کاری هەموومان تەواو و بەبێ شک دەگیراین.

کاتژمێر یەکی دوای نیوەڕۆ ٢٢ی شوبات ڕۆژی سێ شەممە من و (بۆیچنکۆف) لەگەڵ (کوریچکین و زاخاریف) بە تەکسییەک خۆمان گەیاندە فڕۆکەخانە . زۆر بە هێمنی و ئاسایی چووینە ناو ساڵۆنی چاوەڕوانی فڕۆکەخانە . دەتوانرا بە ئاسانی مامووارانی ئاسایشی ئەڵمانیای فیدراڵ لە نێو سەدان خەڵکی تری فڕۆکەخانەکە بناسرێن . پاش ١٠ خولەکی تر فڕۆکەی هێڵی ئاسمانی (پان ئەمریکان Pan – American)پاش نیشتنێکی بە ناچاری لە فڕۆکەخانەی (ئەپینا) دەگەیشتە فڕۆکەخانەی (بۆن) . چوونە ناو ساڵۆنی گومرگ و باندی فڕۆکەخانەکە بۆ پێشوازیکەران ڕێگای پێ نەدەدرا . ئەو نەفەرانەی کە لە (بۆن) هوە نیازی سەفەریان هەبوو دەبوایە پاسەپۆرت و بلیتی فڕۆکە

نیشان بدەن ئەوجا بچنە ناو باندی فڕۆکەخانەکە و ئەوە بێجگە لە دەرگای چوونە ژوورەوە لەناو ئەو پاسەشدا کە نەفەرەکانی دەگواستەوە بۆ نزیک فڕۆکەکە پاسەپۆرت و بلیتەکان تەماشا دەکرایەوە . لێرەدا ماموورێکی فڕۆکەخانەی (بۆن) گەورەترین هاوکاری بۆ سەرکەوتنی بەرنامەکە پێشکەش کرد . ئەو ماموورە کە سالانێکی زۆر بوو لە نووسینگەی نوێنەرایەتی هێلی ئاسمانی (لۆفیانزا - Lofthansa)لە مۆسکۆ کاری کردبوو لەلایەن (K.G.B) یەوە فریودەدرێ و دەبێتە هاوکارێکی خۆجێی ئێمە لە (بۆن) . ئەو بوو ڕێگای چوونە ژوورەوەی ئێمەی بۆ سالۆنی ترانزێت ڕێکخست و لەمەو بەدواش کاری ئێمە ئاسان دەبوو.

کاتێ بەهۆی دەنگ گەورەکەرەوەکان (مکبرە) ی سالۆنی فڕۆکەخانە بانگەوازی نیشتنی فڕۆکەی (پان – ئەمەریکان) لەسەر باندی فڕۆکەخانەکە کرا و بەدوای ئەوەدا نەفەرکانی فڕۆکەکە بۆ ئەنجامدانی کاروباری گومرگ هاتنە سالۆنی ترانزێت من و (بۆیچنکۆف و زاخاریف و کۆریچکین) خۆمان خزاندە ڕێزی نەفەرکان و بە پاسەپۆرت و بەڵگەنامەی دروستکراو (تەزویر) هاتینە پێشەوە . ماموورەکانی گومرک کاتێ کاتێ پاسپۆرتی دبلۆماسی نەتەوە یەکگرتووەکانیان دەدیت بە ڕێزەوە ڕێگای چوونەدەرەوەیان لە سالۆنەکە نیشان دەداین و ئیتر پێویستی بە کارەکانی گومرگی فڕۆکەخانە نەدەکرد.

لە پێشەوە (ڕائد بۆیچنکۆف) و بەدوای ئەویشدا (زاخاریف و کۆریچکین) و منیش لە دواوەی هەموویان بەرەو دەرگای چوونە دەرەوەی سالۆنەکە ڕۆیشتین . هێشتا لە سالۆنەکە وەدەرنەکەوتبووین کە دوو ئەفسەری ئەمریکی بە پلەی موقەددەم لەگەڵ جێگری فەرماندەی هێزەکانی ناتۆ لە ئەڵمانیای ڕۆژئاوا کە دوو فەرمانبەری وەزارەتی دەرەوەی ئەڵمانیایان لەگەڵ بوو، هاتن بۆ پێشوازیکردنی ئێمە و خۆیان ناساند و بەخێرهاتن و هەواڵپرسییان کردین . لە دڵەوە لەو هەموو

گێلییەی ئەوان پێکەنینم گرتبوو، بەڵام ئەوان لەسەر وێنەکانی پسپۆرانی نەتەوە یەککگرتووەکانەوە کە پێشتر ناردرابووە نووسینگەی ئەوان ئێمەیان ناسی.

(موقەددەم مێجەرز) جێگری چالاکییەکانی هێزەکانی ناتۆ لە ئەڵمانیای ڕۆژئاوا کە نسبەت بە ئەوانیتر واپێدەچوو لە پێشتر و پلەی بەرزتر بێت داوای لە ئێمە کرد کە بۆ خواردنی نیوەڕۆ بچینە لای ئەو ).بۆیچنکۆف) گوتی :- نانی نیوەڕۆمان لەناو فرۆکەدا خواردووە . پاش دیدار و پشکنینی ئەم بنکەیە لە ئەڵمانیای ڕۆژئاوا دەبێ بچینە بنکەیەکی وەک ئەمە لە ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات بۆیە واباشترە هەرچی زووترە بچین بۆ دیداری بنکەی (دۆسلدۆرف. (

لە دەرەوەی فڕۆکەخانەکە دوو سەیارەی ڕەنگ ڕەشی (لیموزین) کە ئاڵای (UN) ی پێوە بوو ڕاوەستا بوون . دیار بوو نەخشەی (K.G.B) زۆر بە تەواوی سەری گرتبوو ئەمانە هەموویان فریوی ئێمەیان خواردبوو بەشێوەیەک هاوکاریمان دەکەن بۆ ڕفاندنی کڵاوە ئەتۆمییەکەی (پۆزیدۆن) کە خۆشیان سەیارەیان بۆمان ناردبوو.

)موقەددەم میجەرز) کە پێدەچوو ئەفسەرێکی کەم عەقڵ بێت ڕەزامەندییدا یەکسەر بچینە بنکەی (دۆسلدۆرف) بۆ دیدار و پشکنینی واپێدەچوو کە ئەوان پێشتر خۆیان بۆ ئەم دیدارە ئامادە کردبێ.

)زاخاریف و بۆیچنکۆف) سواری (لیموزین) ی پێشەوە بوون کە (موقەددەم میجەرز) لە کورسی پێشەوەی دانیشتبوو . من و (کۆریچکین) سواری سەیارە لیموزینەکەی تر بووین و سەیارەکان لە کاتێکدا لەلایەن پۆلیسی ئەڵمانیای فیدراڵ و پاسەوانانی نیزامی ئەمریکاوە پاسەوانی دەکران بەڕێکەوتین.

لە دەرگای چوونە ژوورەوەی بنکەی (دۆسلدۆرف) سەیارەکان ڕاوەستان . باڵەخانەیەکی شەش نهۆمی سپی ڕەنگ لە کەناری بنکەکە بوو . ئەوێ بارەگا و ناوەندی فەرماندەیی بنکەکە بوو . سایلۆکان لەوێ دوورتر بوون نەدەبینران . باندێکی فڕۆکەوانی تایبەت بە فڕۆکە نیزامییەکان و هێڵی شەمەندەفەری تایبەت بە گواستنەوەی مووشەکەکان لەناو بنکەکەدا دەبیندران . لە مەودایەکی نزیکتر بەنزینخانەیەکی لێ بوو و تریلەیەکی نیزامی سەرگەرمی بەنزین وەرگرتن بوو . هەموو شتێک ڕێک وەک ئەو نەخشەیە وابوو کە (بۆیچنکۆف) پێشتر باسی بۆ کردبووین پێش دەست کردن بە ماموورییەتەکە و ئێستا دەکرا بڕوا بەوە بکەین کە شێوەی وەرگرتنی زانیارییەکان لەلایەن (K.G.B) یەوە چەندە وردەکار و سەرچاوەکانی چەندە بەهێزن . پاشان بۆم دەرکەوت کە ئەو نەخشەیەی (بۆیچنکۆف) لەلای بوو لەسەر بنکەی (دۆسلدۆرف) لەڕووی ئەو وێنە هەواییانەوە وەرگیراوە کە لەلایەن ماهوارە سیخوڕییەکانی (قمر الصناعی) ڕووسییەوە گیراون.

ئێمەیان بردە ناو بارەگای فەرماندەیی . (موقەددەم مێجەرز)، (کۆلۆنێل ئەبرامز)ی وەک فەرماندەی بنکەکە پێناساندین و ئەویش گوتی :- ئێمە پێشتر لە چۆنیەتی ماموورییەتی ئێوە ئاگادارکراوین . پاشان گوتی :- تەنها شەش مووشەکی (پۆزیدۆن) مان لێرە جێگیر کردوە و ئەو هەراو هۆریایەی ڕووسەکان لە جێگای خۆیدا نییە و لەم جۆرە مووشەکانە تا ئێستا لە شوێنەکانیتری ئەڵمانیا جێگیر نەکراون . چەند دانەیەکی ترمان لەم مووشەکانە لە عەمبارەکاندا هەن، بەڵام هێشتا دانەمەزرێندراون و ئەمەش پەیوەندی بە فەرمانی (واشنتۆن) ەوە هەیە کە لە شوێنەکانیتری ئەڵمانیا دایانبمەزرێنین یان نە.

)بۆیچنکۆف) وەک سەرۆکی شاندەکی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لە کاتێکدا هەوڵی دەدا بەلەهجەیەکی زۆر ئاڵۆز و

دبلۆماسیانە قسە بکات هەندێ لە بابەت هۆیەکانی ئەم مامووریەتە و شاندەکە هاورێکانی دواو (زاخاریف) ی وەک جەنەڕاڵێکی سوپای یۆنان ناساند کە ئێستا لە خزمەت (UN) دایە وەک پسپۆری کاروباری هەستەیی . لە بارەی (کوریچکین) و منیشەوە هەندێ درۆی پێووتن . گفتوگۆکانی (بۆیچنکۆف) بەڕاددەیەک کاریگەری خۆیان کردبوو کە بە روونی دەردەکەوت، چونکە ئەفسەرە ئەمریکاییەکان زیاتر لە پێشوو ڕێزیان لێگرتین و بەوپەڕی ڕێزەوە قسەیان دەکرد . (بۆیچنکۆف) لیستێکی بە مۆری ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لە جانتاکەی خۆی دەرهێنا کە بریتی بوو لە ژمارەی مووشەکەکان و پێناسەیان کە لە بارەی ئەوانەوە هەندێ پرسیاری لە فەرماندەیی بنکەکە کرد و وەڵامی پرسیارەکانی لەناو لیستەکەدا دەنووسییەوە . ئەفسەرە ئەمریکاییەکان لە وەڵامی زۆر لە پرسیارەکان خۆیان دەدزییەوە وەڵامیان نەدەدایەوە لەبەر لایەنی ئاسایشی و پاراستنی نهێنییەکان . پاشان (بۆیچنکۆف) بە لەهجەیەکی زۆر توند و جددی داوای لە (کۆلۆنێل ئابرامز) کرد کە شاندەکی نوێنەرایەتی ببات بۆ دیتنی عەمبارەکان.

)کۆلۆنێل ئابرامز) گوتی :- دیداری عەمبارەکان بە پێویست نازانین ئەو زانیاریانەی کە پێویستتان بوو خرایە ژێر دەستتان.

)بۆیچنکۆف) گوتی :- ئێمە فەرمانمان لە سکرتێری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە پێیە تا بنکەکە بگەڕێین و ئەوەی دەیبینین بینووسین واتە تەنها بە قسەی سەرانی بنکەکە ڕازی نەبین . هەروەها پێویستە ئەوەش بزانرێ هەر ئەمڕۆ دەبێ لەلایەن ئەم شاندەکەوە سەردانی بنکەیەکی هێزەکانی پیادەی (پەیمانی وارشۆ) لە ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات ئەنجام بدرێ . لەدوای ئەمە بۆیچنکۆف) لە جێگای خۆی هەڵسا و گوتی :- بەهەر حاڵ، گرنگ نییە . ئێمە ئاگاداری ئەنجوومەنی ئاسایش (مجلس الامن) دەکەین کە ئێوە ڕێگەتان نەدایین دیداری بنکەکە بکەین.

ئەم ڕەفتارەی (بۆیچنکۆف) کاری خۆی کرد . (کۆلۆنێل ئابرامز) کە دەیزانی شەڕێکی ساردی ڕاگەیاندن لە بەینی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا بەهۆی جێگیربوونی مووشەکەکانی (پۆزیدۆن) لە ئارادایە و لەوانەیە ئەم هەڵوێستەی ئەو بەگران بۆ بلۆکی ڕۆژئاوا تەواو ببێ ڕازی بوو کە خۆی شەخسی ڕێنمایی ئێمە لە دیداری سایلۆ و عەمبارەکان بە ئەستۆوە بگرێت.

جارێکی تریش سەیارەکانی (UN) لەسەر شەقامی سەرەکی بنکەکە بەرەو شوێنی یارییەکە بەڕێکەوتنەوە کە کەوتبووە ٢ تا ٣ کیلۆمەتری باڵەخانەی بارەگای فەرماندەیی بنکەکە.

سەیارەکان لە بەرامبەر خانوویەکی ئەوێ کە ڕەنگی دیوارەکانی ڕەش بوون ڕاوەستان . (کۆلۆنێل ئابرامز) لە پێشەوە و ئێمە لە پشت سەرییەوە چووینە ناو خانووەکە . تەنها دەرەجەدارێکی سوپای ئەمریکا کاری کردنەوە و بەستنی دەرگای چوونە ژوورەوەی بە ئەستۆوە بوو و پاسەوانیتر لەناو شوێنەکەدا نەدەبیندران . ئەمەش ڕوون بوو، چونکە پاسەوانی لەم شوێنەدا بەهۆی دەزگای ئەلکترۆنی و کۆمپیوتەرییەوە ئەنجام دەدرێ . سواری ئاسانسۆرێک (مصعد) بووین کە جێگیر کرابوو و ئاراستەی شوێنەکی تایبەت لە خاکی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات نیشانەی گرتبوو.

پاش دیدارێکی کورتی ئەم سایلۆیە و هەندێ پرسیارکردن لەلایەن (بۆیچنکۆف) ەوە کە زۆر گیلانەم دەهاتە بەرچاو سایلۆکەمان بەجێ هێشت). کۆلۆنێل ئابرامز) گوتی :- پێنج نموونەی تریش لەم مووشەکانە لەم بنکەیەدا دامەزرێندراون.

)بۆیچنکۆف) وەڵامی دایەوە و گوتی :- پێویست بە دیتنی هەموو ئەمانە ناکات، تەنها ئەوەی مەبەستە سەرژمێرییەک لەو

مووشەکانە بکەین کە لە عەمبار دانراون و تا ئێستا جێگیر نەکراون . سەرانی (پنتاگۆن) لەسەر ئەم کارە ڕەزامەندییان نیشان داوە.

کۆلۆنێلی ئەمریکایی گوتی :- منیش ئاگادارم لەسەر ڕازی بوونی (پنتاگۆن) پاشان جارێکی تر سواری سەیارەکان بووینەوە و بەرەو عەمبارەکان کە کڵاوە ئەتۆمییەکانی مووشەکی (پۆزیدۆن) ی تیا دانرابوون بەڕێکەوتین . لەو هەنگاوە بەدواوە کاری ئێمە دەگەیشتە بارودۆخێکی مەترسیدارو خەتەرناک . لەناو بنکەیەکی ئەمریکی کە سەرتاپای چەکدار بوو چوار مامووری (K.G.B) نیازیان وابوو لەبەردەم فەرماندەی بنکەکە دەست بدەنە ڕفاندنی کڵاوە ئەتۆمییەکەی مووشەکی (پۆزیدۆن) و لەگەڵ خۆیان لەم بنکەیە ببەنە دەرەوە و بچن بۆ ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات . وەک ئەم بنکەیەی (دۆسلدۆرف) لە سەرتاسەری خاکی ئەڵمانیا نموونەی زۆر هەن . وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاش لە فەرەنسا، بریتانیا و زۆر شوێنی تر لە ئەورووپای ڕۆژئاوا سایلۆی بۆ مووشەکە ئەتۆمییەکان دروست کردووە و سەکۆی تایبەت بەهەڵدانی ئەم مووشەکانەی لەم شوێنانەدا جێگیر کردووە . ڕووسەکانیش لە وولاتانی ئەندام لە (پەیمانی نیزامی وارشۆ) خاوەنی ئەم بنکە و سەکۆیانەی هەڵدانی مووشەکە ئەتۆمییەکانە . هەردوو وولات بە کەڵک وەرگرتن لە ماهوارە چاودێر و سیخوڕییەکان ژمارەی مووشەکەکان و جێگۆڕی سەکۆکانی هەڵدانی یەکتری دەخەنە ژێر چاودێرییەوە.

بەشێوەیەکی ئاسایی کاتێ مامووریەتێکی گرنگ و پڕمەترسیدار دەدرێتە دەستەیەک پایەبەرز و پڕ ئەزموونترین ماموور هەڵدەبژێرێت بۆ سەرپەرشتی ئەم گرووپە هەروەهاش لە زۆربەی ئەم ماموورییەتانەش شێوە و ئەنجامی کۆتایی ماموورییەتەکە بەندە بە شارەزایی و ئازایەتی ئەو دەستەیە یان ئەو کەسە.

)بۆیچنکۆف) سەرپەرشتی دەستەکەی ئێمە بوو . ئێستا من (داڤیدۆف) لەگەڵ (زاخاریف و کۆریچکین) لە کاتێکدا بەکردەوە چارەنووسی خۆمان بە (بۆیچنکۆف) سپاردبوو لەناو بنکەیەکی پێشکەوتووی مووشەکی سەر بە هێزەکانی پەیمانی ئەتڵەنتیکی باکوور (ناتۆ) بە هاوڕێیەتی فەرماندەی بنکەکە (کۆلۆنێل ئابرامز) کە ئەفسەرێکی پایەبەرزی ئەمریکی بوو هاتوچۆمان دەکرد و لە بیرکردنەوەی ئەوە دابووین کە ڕێگایەک بدۆزینەوە تا بتوانین کڵاوە ئەتۆمییەکەی مووشەکی (پۆزیدۆن) کە قورسییەکەی (١٧٥) کیلۆگرامە و عەقڵی ئەلیکترۆنی هەیە برفێنین . ئەم دزییە دەبوایە لەناو بنکەیە کە سەدان چاوی ئەلیکترۆنی کە جووڵەی هەر حاڵەتێکی نائاساییان خستۆتە ژێر چاودێریی ووردەوە و لەبەردەم کەسانێک کە سەرتاپا چەکدار بوون و ئاگادارییان دەکردن ڕووبدات.

هێشتا دەرفەتێکی وا نەڕەخسابوو کە بتوانین بیروڕایەکی بە کۆمەڵ لەگەڵ یەکتریدا بگۆڕینەوە . لەو کاتەوەی لەژێر ناوی شاندەکی (UN)هاتبووینە ئەم بنکەوە فەرماندە ئەمریکییەکانی بنکەکە لەگەڵمان بوون . (کۆریچکین) بەو ئەنگوستیلەیەی لەدەستی دابوو وێنەی زۆر شوێنی بنکەکەی دەگرت . لەناو ئەم ئەنگوستیلەیەدا کامیرایەکی زۆر حەسساس و ووردەکاری لەناودابوو (K.G.B) . لەم جۆرە دەزگایانە زۆر دروست دەکات و دەیانداتە ماموورەکانی خۆی . ئەنگوستیلە کە کامیرای وێنەگرتنی تێدایە دەرزی بۆینباغ کە وەک چەک بەکاردەهێنرێ یان ئەو میکرۆفۆنانەی کە لەناو دەستەی چاویلکە یا دوگمەی جلوبەرگ جێگای بۆ دەکرێتەوە زۆر جۆری تری لەم جۆرە دەزگایانە). کۆلۆنێل ئابرامز) ڕووی لە (بۆیچنکۆف) کرد و گوتی :- بەپێی ئەو تەلەگرافەی لە (واشنتۆن) ەوە بۆ ئێمە هاتووە ماموورییەتی ئێوە وەک پشکنەرانی (UN)بە سەردانی عەمبارەکانی کڵاوە ئەتۆمییەکان و سەرژمێریان کۆتایی دێت.

ئەم قسەیەی (کۆلۆنێل ئابرامز) بە مانای دەرکردنێکی بە ئەدەبانەی ئێمە بوو لە بنکەکە.

)کۆلۆنێلە ئەمریکاییەکە) بۆ ئەوەی توورەیی خۆی بشارێتەوە گوتی :- ئێستا کە کارتان تەواو بووە خۆشحاڵ دەبین کەلە یانەی ئەفسەرانی بنکەکەمان لە خزمەت ئێوە دابین.

)بۆیچنکۆف) بە لەهجەیەک کە نازانم زۆر پێم گێلانە بوو گوتی :- کۆلۆنێل ئێمە دەبێ راپۆرتەکەمان ئامادە بکەین و لەسەر بنەمای لە پێش دارێژراودا دەبی هەرچی زووترە بچین بۆ سەردانی بنکەیەکی وەک ئەمە لە ئەڵمانیای رۆژهەڵات). کۆلۆنێل ئابرامز) کە تەمەنی ٤٠ تا ٤٥ساڵ دەبوو، وەک منداڵ دەهاتە بەرچاو و بە بەردەوامی یاری بە دوگمەی چاکەتە نیزامییەکەی دەکرد و بە پێکەنینێکی رواڵەتییەوە لە کاتێکدا قسەی لەگەڵ ئێمە دەکرد و گوتی :- بەبێ شک بنکەی ١٤٨ لە (لایپزیک).(بۆیچنکوف) حاڵەتێکی سەرسورمانی بەخۆوە گرت و گوتی :- کۆلۆنێل دەبێ دان بەوە دابنێم کە دەزگا زانیارییەکانی ئێوە بەراستی کاری خۆی بە باشی ئەنجام دەدت . تەنانەت ئەندامانی ئەم گروپەش جگە لە من کەسیان ئاگاداریان نییە لەسەر ئەو شوێنەی لە ئەڵمانیای رۆژهەڵات سەردانی دەکەین تەنها سکرتێری گشتی و فەرماندەی هێزەکانی (UN) و من ئاگاداری ئەم شوێنە هەین.

ئێمە دەمانزانی کۆلۆنێلە ئەمریکاییەکە لەرووی شک و گومانەوە ئەم قسەیەی کردو (بۆیچنکوف) یش درۆی بۆ دەکات، بەڵام ئەم شانۆگەرییە کاریگەرییەکی باشی لەسەر (کۆلۆنێل ئابرامز) کرد، بەشێوەیەک تا چەند خولەکێک نەیتوانی حاڵەتی پێکەنین و بزە لەسەر لێوانی لابەرێ). بۆیچنکوف) جگەرەیەکی پێکرد و لە کاتێکدا دەنکە شقارتە نیوە سووتاوەکەی دەخستە ناو ژێر جگەرەکەوە بە (کۆلۆنێل ئابرامز) ی ووت :- ئەگەر رێگا بدەن وای بە پەسند دەزانم لە جێگایەکی

کرو بێ دەنگ سەرگەرمی ئامادەکردنی ڕاپۆرتەکەمان بین و پاشان خواحافیزیتان لێ دەکەین . بەلانی زۆرەوە تا نیو کاتژمێریتر.

)کۆلۆنێلی ئەمریکایی) پێشنیاری کرد لە هەمان ژووری کاری خۆیدا ڕاپۆرتەکە بنووسین . فەقیرە بەڕاستی پێی وابوو، ئێمە چوار ڕاوێژکاری (UN) بە ناوەکانی (ئەدۆلف زیگفرێد) ی سویدی (هیلمۆت ڤیت) ی هۆلەندی و (کونستانتین ئاندەر و ئەرستۆ پاپاندریاس) ی خەڵکی یۆنانین). بۆیچنکۆف) سوپاسی کۆلۆنێلی کرد و گوتی :- ژووری کاری تۆ شوێنی هاتووچۆی ئەفسەران و کارمەندانی بنکەکەیە کە بۆ کاروباری ڕۆژانە دێنە لات و بەباشی نازانم کە ئێمە ئاگاداری ئەم جۆرە کارانە بین، چونکە پەیوەندی بە ئێمەوە نییە). کۆلۆنێل ئابرامز) زەردەخەنەی هاتێ و گوتی:

- ئێوە لە ئێمە زیاتر پابەندی نهێنییە پارێزراوەکانن زۆر باشە دەتوانم ژوورەکەی تەنیشت خۆمتان بدەمێ و داوا لە (مێجەرز چالز) دەکەم بۆ ماوەیەک بێتە ژوورەکەی لە دوای ئەم قسانە (کۆلۆنێل ئابرامز) ژووری (مێجەر چالز) کە لێپرسراوی نووسینگەی خۆی بوو نیشانی ئێمەی دا . باش ماوەیەکی کورت بۆ گۆڕینەوەی هەواڵپرسی و یەکتر ناسین لەگەڵ (مێجەرز چالز) هەردووکیان واتە کۆلۆنێل و لێپرسراوی نووسینگەکەی چوونە دەرەوە و ئێمەیان بە تەنیا بەجێ هێشت.

)بۆیچنکۆف) بە پەلە داوای لێکردین دابنیشین و لە کاتێکدا هەوڵی دەدا لەسەرخۆ و بە کورتی قسە بکات گوتی :- سەیارەکان لەبەردەم بارەگای فەرماندەیی پارک کراون لەناو عەمبارە ڕەشەکە لە تەنیشت باندی فڕۆکەخانەکە لەناو سایلۆی ژمارە یەک هەشت کڵاوەی ئەتۆمی نوێ ی لێیە کە لە وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاوە نادراون و هێشتا هەر پێچراون و لەناو مۆمدا نەهێنراوەتەدەر من دەگەڕێمەوە ژووری

(کۆلۆنێل ئابرامز) و سەرگەرمی دەکەم تۆ (داڤیدۆف) لەگەڵ (زاخاریف و کۆریچکین) هەرسێکتان بە سەیارەی ژمارە یەک بچوونە ئەوێ و بەهەر شێوەیەک بێت بە کڵاوە ئەتۆمییەکەوە بگەڕێنەوە ئێرە . من هەر لە ژووری (کۆلۆنێل ئابرامز) چاوەڕێتان دەکەم و پاش تەواوکردنی کارەکە هەموومان بەیەکەوە لە بنکەکە دەچینە دەرەوە. بۆیچنکۆف) بەشێوەیەک قسەی دەکرد وەک بڵێی دەچین بۆ ئەوەی گاڵۆنێک ئاو لە لوولەی ئاوێک کە کەوتبێتە ئەو بەری شەقامەکە پڕ بکەین و بیهێنینە ئەم بەری شەقام.

من وای بۆ دەچووم کە ئەمە کارێکی خۆکوژانەیە (انتحار) و ئێمە هەر چوارمان لەم بنکەیەدا گیانی خۆمان لەدەست دەدەین، بەڵام چارە نەبوو دەبووایە فەرمانی (بۆینچکۆف) بەجێ بگەیەنین.

)رائد بۆیچنکوف) چووە ژووری (کۆلۆنێل ئابرامز) تا بە پرسیاری بێ مانا لە بارەی بنکەکە و ئامادەکردنی راپۆرتی دیدارەکە و لەم بابەتانە سەرگەرمی بکات . من و هاوڕێکانم هەرسێکمان زۆر خوێن سارد و هێمن و لەسەرخۆ لەکاتێکدا ئەو کارتە پێناسە تایبەتییەی کە لە سەرەتای چوونە ناو بنکەکە بە سینگمانەوە هەڵیانواسیبوو هێشتا لامان مابون ڕێگای دالانەکەمان گرت تا لە پلیکانەکان بچینە خوارەوە و بە سەیارە بچین بۆ لای سایلۆی ژمارە یەک و (عەمبارە ڕەشەکە) . ئەو عەمبارە، عەمبارێک بوو کە بە شیش و چیمەنتۆ دروست کرابوو و لەناویا ئەو کڵاوە ئەتۆمییانەی تێدا هەڵگیرابوون کە هێشتا بەکارنەهێنرابوون و بڕیار بوو دوایی دایانبمەزرێنن . هەر لەبەر ئەمەش بوو زۆر گرنگییان بە پارێزگاری ئەم شوێنە نەدابوو و بەتایبەتی کە سەرجەم بنکەکە خاوەنی جیهازێکی پارێزگاری تایبەت و ئەوپەری ئاڵۆز بوو و کەسێک بیری بۆ ئەوە نەدەچوو کە لەناو خانوویەکی بنکەیەکی وادا کە بە پێشکەوتووترین سیستەمێک پارێزگاری لێوە دەکرێ کەسێ بتوانێ کڵاوەیەکی (ئەتۆمی پۆزیدۆن) بدزێ و بڕفێنێ.

شۆفێرەکە لای سەیارەکە وەستابوو . (کۆریچکین و زاخاریف) لەسەر کورسی پشتەوە دانیشتن و منیش لەکاتێکدا کە ئاسایی نەبووم لە تەنیشت شۆفێرەکە دانیشتم و فەرمانم پێدا بەرەو باندی فڕین بەڕێبکەوێ . سەیارەکە لەسەر ئەو شەقامەی کە دەکەوتە سەر ڕۆخی باندەکە تێپەڕی و لەبەرامبەر عەمبارە ڕەشەکە ڕاوەستا. عەریفێک) ی ڕەش پێستی سوپای ئەمریکا لە بەرامبەر دەرگای چوونە ژوورەوەی عەمبارەکە وەستابوو و دوو سەربازیش کە نیشانەی (M.P) یان لەسەر قۆڵ نووسرابوو لە تەنیشت عەمبارەکە پیادەڕۆییان دەکرد . کەس ئاگاداری و گرنگی بە ئێمە نەدەدا . ئاڵای (UN) کە لەسەر دەعامیەی سەیارەکە چەقێندرابوو نیشانی ئەوەی دەدا کە ماموورانی (UN) سەرگەرمی گەڕان و دیداری بنکەکەن . چەند کاتژمێرێک پێشتر ئێمە لەگەڵ کۆلۆنێلە ئەمریکاییەکە هاتبووین بۆ دیداری ئەم شوێنە و جێگای سەرسوڕمان نەبوو کە ئەمریکییەکە ئێمەی بەتەواوی لەیاد مابوو لەگەڵ دیتنی ئێمە بۆ ڕێزلێنان بەشێوەیەکی نیزامی وەستا. کۆریچکین) تۆقەی لەگەڵ عەریفەکە کرد و داوای لێکرد کە بمانباتە ژوور عەمبارەکە.

عەریفەکە بە تەلەفۆن لەگەڵ ژووری عەمبارەکە قسەی کرد و دوایی لە ئێمەی پرسی کە بە چ مەبەستێک گەڕاوینەتەوە؟

ئەمجارەیان نۆرەی (زاخاریف) بوو کە توانای خۆی بۆ فریودان بەکاربێنێ . (زاخاریف) گوتی :- عەریف ئێمەش نیازمان نەبوو جارێکی تر بگەڕێینەوە ئێرە، بەڵام فەرماندەی ئەم بنکەیە داوای لە ئێمە کرد کە جارێکی تریش سەرژمێری کڵاوە ئەتۆمییەکانی تازەکان لە عەمباردا بکەینەوە.

عەریفە ئەمریکییەکە ئەم قسانەی (زاخاریف) ی بە تەلەفۆن بەو کەسانە ڕاگەیاند کە لەوبەری سیم لەناو عەمبارەکەدا بوون و پاشان ڕووی لە ئێمە کرد و گوتی :- دەتوانن بچنە ژووری کۆنترۆڵ و پارێزگاری

عەمبار بۆ ئەوەی لەوێوە لەگەڵ فەرماندەیی قسە بکەن و ئەگەر قسەکانی ئێوەیان تەئیدکرد ئەوە دەتوانن دووبارە چەکەکان ببیننەوە

عەریفەکە دوگمەیەکی پاڵداو دەرگای (عەمباری ڕەش) ی کرایەوە . چووینە ژوور عەمبارەکە و ژوورێکی نیشان داین کە کەوتبووە سەرەتای ڕاڕۆیەکە.

لەناو ژوورەکەدا ئەفسەرێکی ژنی ئەمریکایی بە پلەی (نەقیب) و (ڕائد) ێکی سوپای ئەمریکایی لێبوون. ڕائد) هکە داوای لێکردین کەمێک دابنیشین تا ئەو بتوانێ لەگەڵ فەرماندە قسە بکات و لە بابەت داوای ئێمە بۆ دووبارە سەرژمێری چەکەکان کە ئێمە دەمانگووت لەسەر خودی داوای فەرماندەیە بۆ ئەوەی فەرمانی پێویست وەربگرێ. ڕائد) هکە سەری سوڕما بوو کە چۆن بەبێ شارەزا و بە تەنیا ئێمەیان ناردووەتە ئەو شوێنە و لە کاتێکدا بەپێی بەرنامەی پارێزگاری و ئاسایشی بنکەکە هاتووچۆی بیانین لەناو بنکەکەدا دەبوایە بە هاوڕێیەتی ماموورینی تایبەتی پارێزگاری بێت

)کۆریچکین) بە ساردییەوە تەماشایەکی من و (زاخاریف) ی کرد و ماناکەی ئەوە بوو کە چاوەڕێی هەڵوێستی من بن . لەناو ڕاڕۆی عەمبارەکەدا عەریفێکی بە هەیکەلی پاسەوانی سوپایی (انجباگ العسکری) لێ ڕاوەستابوو . چەککردنی ئەفسەرە ژنەکە و ڕائدە ئەمریکییە زۆر ئاسان بوو بەڵام لەناو ڕاڕۆکەدا عەریفێکی (M.P) و لە دەرەوەی عەمبارەکەش دوو سەرباز و عەریفێکی ڕەش پێست هەبوون و نەشمان دەزانی لەناو عەمبارەکەدا کەسانی تر هەن یان نا؟

من دەستم کرد بە کۆخەکردن و بە داوای لێبوردنەوە لە کاتێکدا وا خۆم نیشاندا کە نامەوێت دەنگی کۆخینی من ببێتە مایەی ناڕەحەتی بۆ ئەفسەرە ئەمریکاییەکان لە ژوورەکە چوومە دەرەوە و خۆم گەیاندە ئەو عەریفەی لە ڕاڕۆکەدا پیادەڕۆیی دەکرد و پێش ئەوەی ئاگاداری لە

پڕێکا پەیدابوونی من بێت و بەو دەنگی کۆخینە بەهێزەی من سەری سوڕ بمێنێ چەقۆیەکم لەژێر چاکەتەکەمدا دەرهێنا کە پێشتر شاردبوومەوە و لە وورگم ڕاکرد . هاوڕێکانیشم لەو ماوە کورتەدا هەردوو ئەفسەرەکەیان چەک کرد و دەست و پێیان بەستن و فڕێیاندانە ژوورەکەوە.

جەنازەی عەریف کە بەسەختی خوێنی لەبەر دەڕۆیشت کێشامە ناوەوەی ژوورەکە . (کۆریچکین) چەکەکەی خۆی خستە سەر ناوچەوانی ڕائدە ئەمریکییەکە کە تا ئەم چرکەیەش ناوی ئەومان نەدەزانی ڕەمزی کلیلی عەمبارەکەی لێپرسی.

ڕائدە ئەمەریکییەکە ژمارەی ٨١ ی دەربڕی.

)کۆریچکین) تەماشای (زاخاریف) ی کرد و ئەویش قامکی خستە سەر کلیلی ژمارە ٨١ لەنێو دەیان کلیلی تری سەر مێزی ڕائد و فشاریدا و بە دوای ئەمەشدا دەرگایەکی گەورە لەناوەڕاستی سالۆنەکە کرایەوە بەجۆرێک ئێمە لە دیوارە شوشەییەکەی ژووری ڕائدەوە بە ڕوونی دەمانتوانی ناو عەمبارەکە ببینین . سندوقی تەختەیی کە مارکی (US. ARMY(یان لەسەر نووسرابوو لەسەرتاسەری عەمبارەکە دەبیندران.

)کۆریچکین) ڕائدە ئەمریکییەکە ناچارکرد کە لەگەڵ دەرگای چوونە دەرەوەی عەمبار قسە بکات و بە عەریفە پاسەوانەکەی کە لەبەردەم دەرگاکەدایە و پێی بڵێت کە بە فەرمانی فەرماندەکەی بنکەکە ئێمە دەتوانین سندوقێکی داری لە عەمبارەکە ببەینە دەرەوە.

پارچە پەڕۆکەکەی کە (کۆریچکین) لەناو دەمی ڕائدی دەرهێنا بوو تا بتوانێ بە تەلەفن قسە بکات بکات خستیەوە ناو دەمی بە هەرسێکمان لە ژوورەکە چووینە دەرەوە . چەند خولەکێک دواتر لە کاتێکدا زۆر ماندوو ببووین سندوقە ١٧٥ کیلۆگرامیەکەی کە (کلاوەیەکی ئەتومی پۆزیدۆن)

ی تێدابوو گەیاندمانە پێش دەرگای عەمبارەکە و داوامان لە عەریفە ڕەش پێستە ئەمریکییەکە کرد کە یارمەتیمان بدات بۆ ئەوەی بیخەینە ناو سندووقی پشتەوەی سەیارەکە.

پاش ئەنجامدانی ئەم کارە بەرەو بارەگای فەرمانده‌یی بنکەکە گەڕاینەوە . (بۆیچنکۆف) دوایی بۆی باس کردم کە ئەو کاتەی لە ژووری (کۆلۆنێل ئابرامز) بووە، لەگەڵ ئەودا سەرگەرمی مەی خواردنەوەو قسەکردنی خۆش بووە و کۆلۆنێل وای زانیوە کە ئێمە لە ژوورەکەیتردا سەرگەرمی ئامادەکردنی ڕاپۆرتەکەین . کاتێ گەیشتینەوە پێش بارەگای فەرمانده‌یی تەنها (زاخاریف) دابەزی و بەپەلە خۆی گەیاندە ژووری (کۆلۆنێل ئابرامز)، چونکە مەترسی ئەوە هەبوو هەر چرکەیەک ڕووداوەکەی عەمبار ئاشکرا بێ و هەمووومان بگیرێن.

)زاخاریف) چووە ژووری کۆلۆنێل و بە (بۆیچنکۆف) ی ووتبوو :- ئێمە ڕاپۆرتەکەمان ئامادەکردووە و تەواو بووینە و هەمووومان لەناو سەیارەداین چاوەڕێی تۆ دەکەین بۆ ڕۆیشتن.

)کۆلۆنێل ئابرامز) تا نزیک سەیارەکە هات و لە کاتێکدا بە هیچ شێوەیەک ب خەیاڵی نەدەهات کە ئەم سەیارەیە چ شتێک لە بنکەکە دەباتە دەرەوە مەراسیمی خواحافیزی بەشێوەیەکی کورت ئەنجام درا و سەیارەکانی (UN) بەرەو دەرگای چوونە دەرەوەی بنکەکە بەڕێکەوتن.

لەبەردەرگای چوونە دەرەوەی بنکەکە مامووریني تایبەتی پارێزگاری جارێکی تریش بەڵگەنامە و پێناسە تەزویرەکانی ئێمەیان تەماشا کردەوە و بە تەلەفۆن لە فەرماندەی بنکە فەرمانی چوونە دەرەوەی ئێمەیان وەرگرت پاشان ڕێگایان بۆ کردینەوە و لە بنکەکە وەدەرکەوتین لە کاتێکدا (کڵاوە ئەتۆمییەکەی مووشەکی پۆزیدۆن) لەناو سندوقی سەیارەی (لیموزین) دابوو کە هەڵگری ژمارەی سیاسی و پەرچەمی (UN)بوو.

ڕووداوی ڕفاندنی کڵاوه ئەتۆمییەکە لە ئەڵمانیای ڕۆژئاوا لە (بنکەی دۆسلدۆرف) ی سەر بە (ناتۆ) زۆر نەشاردرایەوە و کاردانەوەی لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکان و دەزگا ڕاگەیاندنە گشتییەکانی جیهان بە فراوانییەکی بێ وێنە دەنگی دایەوە . ئەوان نووسیبوویان کە ڕفێنەرانی (کڵاوە ئەتۆمییەکەی پۆزیدۆن) تا ئێستا نەناسراون.

)داڤیدۆف) بەردەوام بوو و گوتی :- بەڵام ئێمە زۆر ئاسان و بە ئارامی وەک بڵێی بۆ گەشتێکی کۆتایی هەفتە دەچین لە کاتێکدا چەکێکی کوشندەمان لە سندوقی پشتەوەی سەیارەکە دابوو کە بە تەقینەوەی نیوەی ئەڵمانیای وێران دەکرد.

لەسەر شارێی (داخو کارلسروهە) سەیارەی خۆمان گۆڕی و پاش سڕینەوەی شوێن پەنجەمان لەسەر زۆر شوێنەکانی سەیارەکە ئەومان بەجێهێشت و سواری سەیارەکیتر بووین کە چاوەڕێی دەکردین و بەرەو باڵوێزخانەی ڕووسیا لە (بۆن) بەڕێکەوتین . هاوڕێکانم بە شێوەیەک کڵاوە ئەتۆمییەکەیان لە سەیارەی یەکەمەوە گواستەوە بۆ سەیارەی دووەم وەک بڵێی سەرگەرمی گواستنەوە و هەڵگرتنی جانتایەکن کە جلوبەرگی تیا بێت.

لە ڕێگادا تووشی ڕووداوێک نەبووین کە شایانی باس بێت و هیچمان نەهاتە پێش . لەناو باڵوێزخانەش ئێمە کارێکمان نەبوو . سەیارەکەی کە کڵاوە ئەتۆمییەکەی تێدابوو لە ئێمەیان وەرگرت و ئێوارەی هەمان ڕۆژ بە ڕووخساری ڕاستەقینەی خۆمان و بە پاسپۆرتی دبلۆماسی کە لە پێشتر بۆمان ئامادەکرابوو لە فڕۆکەخانەی (بۆن) ەوە بەرەو شوێنی سەرەکی مامووریەتەکەمان گەڕاینەوە و (بۆیچنکۆف) یش گەڕایەوە (مۆسکۆ. (

هەر چوار ماموورە ڕاستەقینەکەی (UN ) پاش تێپەڕبوونی ٢٤ کاتژمێر بەسەر ماموورییەتەکەدا لە قەراغ شاری (ئەپینا) بەدەرکەوتنەوە . ئەوان گوتیان :- کە ڕفێنەرانی ئەوان ئەندامانی ڕێکخراوێکی تێرۆریستی بوون

ماموورانی (K.G.B) لەو ماوەیەدا کە ئەم چوار ڕاوێژکاری (UN) یان لەلابوو بەتەڕدەستی و زیرەکی وایان تێگەیاندبوون کە ئەندامی ڕێکخراوێکی تێرۆریستین و مەبەستی ئەوان لە ڕفاندنیان بۆ ئەوەیە کە سەرنجی بیروڕای گشتی جیهان بۆ لای ڕێکخراوە سیاسییەکەیان ڕابکێشن.

بێگومان لێپرسراوانی ئەمریکی کە پێشوازییان لە چوار ماموورە تەزویرەکەی (UN) لە بنکە (دۆسلدۆرف) ی سەر بە هێزەکانی (ناتۆ) کردبوو و خۆیان لە ڕفاندنی (کڵاوەیەکی ئەتۆمی پزیدۆن) هاوکارییان کردبوون دوای بەدەرکەوتنەوەی چوار ماموورە راستەقینەکەی (UN) لە (ئەپینا) ئاگاداری پەیوەندی هەردوو ڕووداوەکە بوون بەیەکتری و زانیان کە پەیوەندییان بەیەکەوە هەیە . بەلام تا پێش هەڵاتنی من (میاگۆف) بۆ ڕۆژئاوا تەنانەت دەزگا سیخوڕییەکانی ئەمریکا و ئەڵمانیای ڕۆژئاوا لە ئاشکراکردنی ڕووکاری ڕاستەقینەی ڕفێنەرانی کڵاوە ئەتۆمییەکە بێ توانا مابوونەوە . بۆ ماوەیەک ئەم ڕووداوەیان دەدایە پاڵ وولاتێکی عەرەبی لە باکووری قارەی ئەفریقیا و ماوەیەکیش فەڵەستینییەکانیان تاوانبار دەکرد.

## دەرەنجامێکی گشتی

ئەوەی بۆم باس کردن تەنها چەند نموونەیەک بوون لە چالاکییەکانی (K.G.B)لە شوێنە جیاجیاکانی جیهان کە من شاهێدی ئەوان بووم . بۆ ئەنجامدانی چالاکیە سیخوڕییەکان هەموو ئۆرگانەکان و ڕێکخراوەکان و دام و دەزگاکانی پێکهێنەری یەکێتیی سۆڤیەت لە خزمەتی (K.G.B) دایە تەنانەت هێزی دەریایی و ژێر دەریاییش بەهەمان شێوە . ئەم ژێر دەریاییانە (غواصە) لە نزیک بنکە دەریاییەکانی دوژمن سەرگەرمی بەدەست هێنانی دەنگ و باسن . هەروەها (K.G.B) کەڵک لە فڕۆکە سیخوڕییەکانیش وەردەگرێت و تەنانەت وێستگەکانی ماهوارەیی لە مەداری زەویدا بەکاردەهێنێ بۆ کارە سیخوڕییەکان . ئەم چالاکیانەش تەنها شوێنەک، ناوچەیەک، یان وڵاتێک ناگرێتەوە لەسەر نەخشەی جیهاندا، بەڵکو لە جەزیرەکانی (سولەیمان) لە ئۆقیانوسی ئارامەوە بگرە تا ئەفریقیا و ئەمریکای باکوور و چین و تەنانەت جەمسەری باشوور (قکب الجنوبی) یش دەگرێتە خۆی . هەر شوێنەک لە بەرژەوەندی ڕووسیای لێبێ ئەوە هەست بە بوونی (K.G.B) دەکرێت تیایدا.

کەچی لەناو وڵاتدا بارودۆخەکە لەمەش خراپترە . هاووڵاتیانی ڕووسی ناچارن لەژێر ڕەحمەتی یاسا و هەزاران دەستوولا کە ڕژێمی کۆمۆنیستی دایناوە ژیان ببەنە سەر ئەوەی سەرپێچی بکات لەوانەیە زیندانی بکرێن بنێردرێنە ئۆردوگاکانی کاری بەزۆری یا کاری خۆیان لەدەست بدەن وە یا لە وەرگرتن لە دەزگا زانیارییەکان ڕێگەیان لێ بگیرێت و . هتد.

لیستێکی گشتی کە هەموو دەستوورەکانی تێدایە لەژێر دەستی هەموو هاووڵاتییەکی ڕووسی دایە نیزامی بێت یان غەیرە نیزامی و نیشتەجێی

دەرەوەی وولات بێت . بۆ نموونە کارمەندانی نیزامی و هەروەها هاوولاتیانی غەیرە نیزامی نیشتەجێی ئەڵمانیای ڕۆژهەلات ناتوانن ئازادانە پەیوەندییان لەگەڵ هاوولاتیانی ئەم وولاتەدا هەبێت گەرچی لە باری چین و توێژ و بیر و بۆچوون و چەکەوە یەکن . ئەفسەران و سەربازان و ئەندامانی خێزانەکانیان بە هیچ شێوەیەک ڕێگایان پێ نادرێت شوێنی کاریان و سەربازخانە بەجێ بهێڵن و بچنە دەرەوە . بەتایبەتی دیداری بەرلینی ڕۆژئاوا قەدەغەیە، چونکە لەم شارەدا خەڵکی وولاتە سەرمایەدارەکانی وەک ئەمریکا، بریتانیا، فەرەنسا و ئەڵمانیای ڕۆژئاوای لێیە و لەوانەیە پەیوەندی نارێک لەگەڵ هاوولاتیە ڕووسەکان ببەستن (K.G.B) . لەوە دەترسێ کە لەوانەیە ئەم هاوولاتیە ڕووسانە بەهۆی سیخوڕەکانی ڕۆژئاواوە فریو بدرێن بۆ کارکردن لەگەڵیان یان بە یەکجاری هەڵبێن بۆ ڕۆژئاوا.

فەرماندە نیزامی و ڕێبەرد حیزبییەکان لەم جۆرە پەیوەندییانە دەترسێن. چونکە لەوانەیە ببێتە هۆی وەرگرتن و بلاوبوونەوەی ئایدۆلۆژی سەرمایەداری. پێویستە ئەوەش بزانرێ کە ئەم شتە ڕێگا پێنەدراوانە تەنها بۆ خەڵکە سادەکەی میللەتەکەیە . جێگای خۆیەتی پرسیار بکرێت ئەی ئەوانەی دەسەلاتیان بەدەستەوەیە و بەرگری لەم دام و دەزگایە و فەرمانڕەوایەتییەی دەکەن چۆن دەژین؟ ئەی ژیانی ماموورانی (K.G.B) چۆنە کە (شمشێر و سپەری) ڕژێمی ڕووسیان؟

لەوانەیە واتان بە خەیاڵ دابێت کە ئەمانە بەرگری لەم ڕژێمە دەکەن و لە پێناو بەهێزکردنیدا هەوڵدەدەن لە کۆمۆنیستە بە باوەڕەکانن؟ بێگومان هەرواشە، بەلام ئەوان بڕوایان بە کۆمۆنیستیەکی تایبەت خۆیان هەیە تایبەتە بە چینە دەست نیشان کراوەکە کە (مافیا)ی ئەوانیترن . بۆ (مافیای ڕووسیا) ئەو ئایدۆلۆژییەی کۆمۆنیستییەی فێری جوو تێرێکی سادە دەکرێ جیاوازە لە هی ئەو . بۆ (مافیا) کۆمۆنیزم بە مانای فەرمانڕەوایەتی کردنە بەسەر چین و توێژەکانیتری کۆمەڵدا و

ژیان بە خۆشی بردنەسەرە بە بودجەی خەڵک . ئەو یاسا و دەستوورانەی کە هەموو کەس بگرێتەوە وەک ئەو کۆمۆنیزمە سەربازخانەییە وایە کە (چکا) بڕوای پێی هەبوو.

کۆمۆنیستەکان بەڵێنی دوارۆژێکی گەش و ئاسوودە و برایەتی و یەکسانی بە کارگەرە سادەکان دەدەن، بەڵام ناڵێن ئەم دوارۆژە کەی دەگات؟ خەڵک کۆمۆنیزم بە تراویلکەیەکی (سراب) فریودەر پێناسە دەکەن کە هەرچەند لێی نزیک ببنەوە دوورتر دەکەوێتەوە.

ماموورانی (K.G.B) ئازادی شەخسییان لە خەڵکی تر زیاترە . ئەمان دەسەڵاتێکی زۆریان هەیە و کۆنترۆڵ و چاودێری چین و توێژەکانیتری خەڵک دەکەن . هەر بۆیەشە لە بواری کاروباری سیاسیدا بۆ (K.G.B) هیچ شتێک ڕێگای لێنەگیراوە . لە بیروبۆچوون و قسەکردنیان لەسەر ڕێبەرانی رووسی و سیاسەتی ناوەوە و دەرەوەی وولاتدا بێ پەردە قسە دەکەن، بەڵام لە چوارچێوەی یاسایەک کە (بیروبوچوونەکان لە چوارچێوەی مەبەستی دیاریکراوی (K.G.B) نابێ بەدەر بێت) . ئەم ئازادییە نوێنەرایەتی تایبەتمەندییەکی نەنووسراو دەکات بەم ڕستەیە دەکرێ پێناسە بکرێ (ئەوەی بۆ (ژوپیتەر (Jupiter – ڕەوایە بۆ گا ڕێگای پێنادرێت) . بینایی چاوی چینێکی نوێی کۆمۆنیست یا سەرمایەداری ڕووسیان.

لەکاتی گفتوگۆکردن لەگەڵ هاوکارەکانم زۆر جار گوێم لە بیروبۆچوونی جیاواز دەبوو لەسەر لێپرسراوانی دەوڵەت و لەوانەش (لیۆنید برژنێف) . بە توندی ڕەخنەیان لێ دەگرت لەسەر نەرمی سیاسەتی ناوەوە و هەڵەکانی لە سیاسەتی دەرەوەدا . لەگەڵ ئەوەشدا دەبێ بگوترێ کە (K.G.B) بەگەرمی پشتیوانی لە (برژنیف) دەکرد، چونکە لێپرسراوی ئەوکاتی)(K.G.B) یوری ئەندرۆپۆف) لەلایەن ئەوەوە دانرابوو . (برژنێف) پشتیوانی لە (ئەندرۆپۆف)ی دەکرد و

زۆری خۆشدەویست بەراددەیەک کە چەند مانگ پێش مەرگی خۆی (ئەندرۆپۆف) ی کردە ئەندامی مەکتەبی سیاسی و زەمینەی خۆش کرد بۆی بۆ ئەوەی ببێتە سکرتێری گشتی حزبی کۆمۆنیست و ڕێبەری ڕووسیا . لە هەمان کاتدا دەبێ ئەوەش بگووترێ کە (برژنێف) ئیمتیازی زیاتری دابووە ماموورانی (K.G.B) و مووچەی کارمەندان و بودجەیان زیادکرا). موقەددەم سپیرین (Spirin – کە سەرۆکی بەڕێوەبەرایەتی تایبەتی (K.G.B) سەر بە سوپای ٢١ ی پاسەوان بوو دەیووت : (برژنێف) وەک (خرۆشچۆف) کەم عەقڵ و تەمبەڵ نییە و ئەو دەزانێ بەبێ (K.G.B) کارێک ناکرێت و بۆیە ناکرێ نادیدە بگیرێ.

ڕەخنە لەسەر ئەندامانێتری (مەکتەبی سیاسی) هەبوو . ئەندامانی (چکا) بەتایبەتی (کەنایف (Cunaev – یان بە کەم و نزم تەماشا دەکرد و بەهۆی زۆر مەی خواردنەوە و تەمبەڵی ڕەخنە و گلەییان هەبوو لەسەر و بە ئەندامێکی بێ کەڵکی دەوڵەت لە قەڵەمیان دەدا.

ئەندامانی (K.G.B) لە دیدارو گفتوگۆکانیان لەکاتی دانوستاندنەکاندا بەتایبەتی باس لە ئازادی سیاسی لە ڕووسیا و هێما دەبەن بۆ سەندیکا کرێکارییەکان و ئەنجومەنە خۆجێییەکان . ئەمانە تەنها بە ڕواڵەت هەن لەبەر بیروڕای گشتی جیهان و لە ڕاستیدا بە کردەوە ڕۆڵێکیان نییە . (K.G.B)لە هەموو کەس باشتر دەزانێ و داکۆکی لەسەر دەکا و ئەوانەی باسیان کرا تەنها بە (جامخانەی کۆگا) ناویان دەبا.

لەماوەی خزمەتکردنم دا لە یەکە جۆراوجۆرەکاندا کە هەمیشە پەیوەندیم لەگەڵ ئەفسەراندا هەبووە شارەزاییەکی تەواوم لەسەر ژیانی ڕۆژانەیان لە نزمترین و پایەبەرزترین پلەدا پەیدا کردووە . ئەفسەرە کادیرەکان دەکرێ بۆ سێ دەستە دابەش بکرێن:-

پلەی فەرماندە بەرزەکانی سوپا.

· ئەو فەرماندانەی کە ناویان لە لیستی حزبی کۆمۆنیستی ڕووسیادا هەیە لەمانەش فەرماندە ناوچەییەکان لێپرسراوانی بەڕێوەبەرایەتییە تایبەتییەکان و لێپرسراوانی بەڕێوەبەرایەتییە سیاسییەکانی ناوچەکان فەرماندەکانی سوپا و جێگرەکانیان لەمانیش پلە بەرزتر.

ئەو ئەفسەرانەی کە لە ژێر دەستی ئەم دوو گرووپەی ناوبراو کاردەکەن . دوو گروپەکەی یەکەم سەر بە (مافیای ڕووسیان. (

فەرماندە پایەبەرزەکان دەسەڵات و توانای تەواویان بەسەر سوپادا هەیە و سەرۆکایەتیەکەشی مەکتەبی سیاسی و دەوڵەتە کە سوپای بۆ هاریکاری (K.G.B) و لێپرسراوە بەرزەکانی حزب لە ژێر کۆنترۆڵ دایە . بۆ ئەوان لەلایەنی ئیمتیازە ماددیەکان هیچ بەربەست و چوارچێوەیەک نییە . بەو مووچە یەکجار زۆرەی وەریدەگرن دەتوانن ئاستی ژیانیان گەلێ زۆر باشتر لە زۆربەی سەرمایەدارە ڕۆژئاواییەکان بکەن . بە بەکارهێنانی دەسەڵات و توانایان بەسەر سوپادا دەستکەوتی زیاتر بەشێوەیەکی ڕەسمی بەدەست دێنن و دەتوانن ژیانێکی مۆدێرن بۆ خۆیان دابین بکەن . ئەمانە خاوەنی ڤیللای خۆش و ئاسوودەن کە لەلایەن بنکەکانی سوپاوە دروست کراون . ئەم ڤیللایانەش دەکەونە شوێنی ئارام بە ناوو هەوای خۆش وەک کەنارەکانی (دەریای ڕەش و دەریای باڵتیک و مولداوی) . بنکە سوپاییەکان پاسەوانی لەم ڤیللایانە دەکەن و زۆربەی خزمەتچییەکان لەو سەربازانەن کە مووچەیان نییە و لەگەڵ ئەوەشدا زۆر گوێڕایەڵی . ئەندامانی فەرماندەیی پایەبەرز لەکاتی پشوودان و مۆڵەت وەرگرتن دا کەڵک لە فڕۆکە یان سەیارەی تایبەتی وەردەگرن . دەتوانرێ بگووترێ کە ئاسنی سەلامەتی و پارێزگاری لەمانە تەنانەت لە هاوکارە غەیرە نیزامییەکانی خۆشیان لەم دەزگا مافیایەدا گەلێ زیاترە، چونکە ئەوانەی لەژێر دەسەڵات و کۆنترۆڵی ئەواندان هەموویان نیزامی و مل کەچی یاساکانی سوپان، بۆیە دەست

لەسەر سینگ و ئامادەی خزمەتن . بێجگە لە چەند حاڵەتێکی زۆر کەم کە دەتوانرێ لەمانەی تر جیا بکرێتەوە دەکرێ ئەم ئەفسەرانە لەگەڵ دەرەبەگە گەورەکانی ڕووسیای (تزاری) لە چەرخی (سیرف (Serf – بەراوردبکرێن، چونکە ئەمانیش هەرچی ئارەزوویان لێ بووایە دەهاتەدی و ژیان و مردنی جگوتیارەکانی (سیرف) لە ژێر دەستی ئەواندا بوو.

فەرماندە پایەبەرزەکانی تریش نزیکەی هەمان دەسەڵاتیان هەیە . هەرکاتێ بیانەوێ دەتوانن هەر سەربازێک یان خزمەتکارێک بکێشنە دادگا و چەندین ساڵ زیندانی بۆ ببڕنەوە تاوانبار یان بێگوناح گرنگ نییە . لە بواری نیزامیدا لەکاتی پێویست دەتوانن سەربازەکان بە تاوانبار لە قەڵەم بدەن و ئەفسەرە سادەکان یانی ئەوانەی ناویان لەناو لیستی ناوەکانی حزبدا نییە بکێشنە دادگا . سەبارەت بە ئەفسەرەکان زورتر سەرنجیان رادەکیشرێ یان پلەی ئەفسەری یان دادەبەزینری و سزای تریشیان بەسەردا دەسەپێنرێ و بەمە وازیان لێ دەهێنرێ.

لەبەینی ئەفسەرە پایەبەرزەکانی سوپا و دەرەبەگەکانی (سیرف) لە هەندێ لایەنی تریشدا وێکدەچن . هەردووکیان خاوەن زەوی و دەریاچە و دارستانن . زەوی زور بۆ مەشق و مەبەستی تر دراوەتە سوپا هەموو ئەو دارستان و دەریاچانەی کەناری ئەم زەویانە کە نووساون بە شوێنە غەیرە نیزامییەکانەوە لەلایەن (مافیای ڕووسیا) وە کەڵکی شەخسییان لێ وەردەگیرێت.

لە نزیک (کۆناس (Kaunas – لە کۆماری (لیتوانیا) مەیدانێکی مەشقی تەقەکردن (میدان الرمی) ی لێ یە کە تایبەتە بە مەشقی لەشکری بەرگری هەوایی (دفاع الجوی) . لە تەنیشت ئەم مەیدانە دەریاچەیەکی بچووک و جوانی لێیە کە لە کەنارەکەی ڤیللایەکی تایبەتی بە باخچەکەوە لێ دروست کراوە و هەمیشە چەند کەسێک لەو ناوە

پاسەوانی دەکەن . ئەم پاسەوانییە بۆ پاریزگاری لە مەشقە نیزامییەکان نییە و بەڵکو مەبەستیان پاراستنی ڤیللاکەیە کە شوێنی حەوانەوەی فەرماندەکەیە.

)جەنەراڵ ماگیلۆف (Margelov – کە فەرماندەی لەشکرەکەیە لەناو دەریاچەکەدا ڕاوو ڕاوەماسی دەکات . بێجگە لەمەو وەک ئەم دەریاچەیە و شوێن ڕاوەی لە (تولاTula – ، فێرگاناFergana ، پێسکۆف Peskov – و مولداوی) هەیە و هەندێ جار کەڵک لە فڕۆکەی تایبەتی وەردەگرێ بۆ سەردانی زەوییەکانی.

نموونەیەکی تریشم هەیە لەسەر خۆ بەگەورە زانین و ژیانی ئەفسەرە پایەبەرزەکان:

لە هاوینی ساڵی ۱۹۷۱ سوپای بیستەمی پاسەوان مانۆڕێکی لە ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات ڕێکخست . فەرماندەی ئەوکاتی یەکە نیزامییەکانی سوپای ڕووسیا لە ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات جەنەڕاڵ (کولیکۆف – (Kulikovبوو کە خۆی سەرپەرشتی بەشی هەرە زۆری مەشقەکانی لە بارەگای فەرماندەییەوە دەکرد (ئەو ئێستا سەرۆکی فەرماندەیی گشتییە بە پلەی مارشال. (

)کولیکۆف) تەنها یەک جار هاتە مەیدانی مەشقی تەقەکردن (میدان الرمی) (ماگدبۆرگ) و چۆنیەتی مەشقی تەقەکردن (رمی) ی لەشکری شەشی پاسەوانی بەسەرکردەوە . بیست و چوار کاتژمێر پێش هاتنی جەنەڕاڵ دوو فەوجی ئەندازیاری بەسەرف کردنی بوودجەیەکی زۆر و هەوڵ و تەقەلایەکی زۆر و بێ ووچان و بەرچاوو بۆ ماوەی بیست کاتژمێر سەرگەرمی قیرتاوکردنی ئەو ڕێگایە بوون کە دەهاتە مەیدانەکە بۆ ئەوەی جلوبەرگە نیزامییەکەی جەنەڕاڵ بە گەرد و خۆڵ نەبێت، جەنەڕاڵ تەنها دوو کاتژمێر لە مەیدانەکە مایەوە و تەنها یەکجاریش بەسەر ڕێگا تازە دروست کراوەکەدا ڕۆیشت، چونکە بە

هەلیکۆپتەر گەڕایەوە بۆ بارەگای فەرماندەیی خۆی . لەوجارە بەدواوە هەرگیز کەڵک لەم ڕێگایە وەرنەگیرا و وەک یادگاریکی (جەنەڕاڵ کولیکۆف) مایەوە.

ژمارەیەکی زۆر لەم بابەتە یادگارییە تازە دروست کراوانە لە مەیدانەکانی تەقەکردن لە سەرتاسەری ڕووسیا و وولاتەکانی ئەندامی پەیمانی (وارشۆ) لە کەس شاراوە نین.

لە سوپای بیستەمی پاسەوان ناوی جەنەڕاڵ (سیڤینۆک – Sivenok)بەوە ناوی دەرکردبوو کە زۆر لە ڕاددەبەدەر حەزی لە پارە کۆکردنەوەیە و هەوڵی ئەوە دەدا تەنانەت دۆلارێک لە مووچەی خۆی سەرف نەکات . هەموو شتێکی وەک موبیلیات فەرش، سێتی نان خواردن و وێنەکێشان . هتد، بەشێوەیەکی ڕەسمی لەسەر بوودجەی فەرماندەیی یان یانەی ئەفسەران دەکڕی و بەڵام ڕاستەوخۆ دەبردرایەوە ماڵەکەی ئەو . خواردن و خواردنەوەی بە خۆڕایی لە چێشتخانەی گشتی و تەنانەت جارجاریش لەسەر حیسابی بودجەی فەرمانبەری چێشتخانەکە دابین دەکرا.

ئەم نموونانەی باسم کردن وەنەبێ هەندێ حاڵەتی تایبەتی و کەم بن . نەخێر، ئەمانە ڕووداوی ڕۆژانەن و بەڵام چونکە ئەوانەی ئەنجامی دەدەن (کۆمۆنیستە ڕاستەقینەکانن) بۆیە شاراوە و دیار نین . هەندێ جار ئەم کۆمۆنیستانە بەڕاددەیەک زۆر دەڕۆن کە ئەنجامی خراپ و ترسناکی لێدەکەوێتەوە . یەکێک لەو نموونانەش کە بە هۆی ڕەفتارە ناشایستەکانی لەم بابەتانەی و بۆتە وێردی سەر زمانان و هەموو کەس باسی دەکرد و وەک خۆیان دەڵێن حزبی لەکەدار کردبوو ئەمەی خوارەوەیە.

جەنەڕاڵ (پیتکەڤیچ Pitkevich) – کە فەرماندەی تیپێک و فەرماندەی سەربازخانەی بەرلینی ڕۆژهەلات بوو لە وەزارەتی بەرگری

ڕووسیا ناسیاوی هەبوو . بە کەڵک وەرگرتن لەم دەرفەتە بەبێ پەردە و بێ ترس کەوتە کۆکردنەوەی پارە . لەگەڵ یەکێک لە فەرمانبەرانی عەمباری ئازووقە پەیوەندی دروست کرد . ئەو ئەفسەرەکەی کە لە ژێر دەستی ئەودا کاری دەکرد ئەفسەرێکی ئەو سەربازخانەیە بوو و ١٥ ساڵ بوو لە ئەڵمانیای ڕۆژهەلات خزمەتی دەکرد و زۆر کەسی دەناسی . لەسەر فەرمانی جەنەڕاڵ دەستی کرد بە فرۆشتنی کەل و پەل لە بازار بە نرخی هەرزان . پاش ماوەیەک دەستی لەگەڵ هەندێ لە دۆستەکانی پەیداکرد کە لە عەمبارەکانیتر بوون . ئەم کارە بە باشی بەردەوام بوو و گیرفانی (جەنەڕاڵ پیتکەڤیچ) پڕ بوو لە دەیان هەزار مارک . بەڵام زۆربەی نەبرد فەرمانبەرانی تیپەکە ئاگاداری ئەم وەزعە بوون و قسە کەوتە سەر زمانان و هەندێ لە نیزامییەکان ئەویان بە فێڵباز و هیچ پووچ ناو دەبرد. خراپ بیرکردنەوە لە بابەت ئەندامانی (مافیا) بڤەیە تا چی بگاتە ئەوێ قسەی ناشیرینیان پێ بگووترێ (K.G.B) . دەستی دەکارەکە وەردا و لەسەر ڕاسپاردەی ئەم دەزگایە دادگای نیزامی دەستی بە لێکۆڵینەوە کرد . بێگومان ئەنجامی لێکۆڵینەوەکان جەنەڕاڵ تاوانبار و گوناهبار نەکرا و هەروەک جاران بە کەسێکی بڕوا پێکراو و دڵسۆز دەرچوو . بەڵام لێپرسراوی عەمبار کە کەڵکی لە متمانەی جەنەڕاڵ (سۆ إستفادە) ی وەرگرتبوو (بە پێی بڕیاری نمایشی دادگا نەک لە ڕاستیدا . و) بە تاوانبار دەست نیشان کراو هەروەها پارەیەکیش و نەچووبووە گیرفانی جەنەڕاڵ و ئاگاداری هیچ نەبوو. دادگای نیزامی لێپرسراوی عەمباری بە ساڵ و نیوێک زیندان تاوانبار کرد، بەڵام چونکە هەموو لایەک ڕاستییەکەی دەزانی بۆیە جەنەڕاڵ گواسترایەوە بۆ ڕووسیا و دوایی خانەنشین کرا.

لەم جۆرە ڕووداوانەم زۆر لە میشکدان و ئەم چەند نموونانەشم بۆیە باسکردن بۆ ئەوەی وەڵامی ڕۆژنامەکانی ڕووسیا بدەمەوە کە هەلاتنی من بۆ ڕۆژئاوا بە (خیانەت بە وولات) لە قەڵەم

دەدەن . من هەرگیز خیانەتم بە میللەتەکەم نەکردووە، بەڵکو بۆ بەدیارخستنی ڕووی ڕاستی فەرمانڕەوایانی حکومەتی ئیمپراتۆڕی کۆمۆنیستی نوێ کە میللەتەکانی ڕووسیای خستووەتە ژێر دەسەڵات و زەبر و زەنگی خۆیەوە، پەنام بردۆتە بەر ڕۆژئاوا . زۆر لەو هاووڵاتیانەی ڕووسی کە لە دەرەوەی وولات کاردەکەن ئەگەر بچووکترین مۆڵەتیان بۆ بڕەخسێ ئەوا زۆر بە پەلە پەنا دەبەنە بەر ڕۆژئاوا . بەڵام دەوڵەت بۆ ڕێگەگرتن لەم کارە ژن و منداڵ و خاوو خێزانی ئەوانی لە ڕووسیا وەک بارمتە (رهائن) لەژێر دەستدایە.

ئێستا کە ساڵانێکی زۆرە ڕووسیام بەجێ هێشتووە و نیشتەجێی ڕۆژئاوام لێرەش لە نیوە گۆی ڕۆژئاوای زەوی هەست دەکەم خەڵک چۆن لە ڕووسیا دەژین لێرەش بە هەمان شێوە دەژین . لێرەش دەزگای سیخوڕی و نهێنی تۆقێنەرێ وەک (C.I.A) و دەزگای زانیاری و تۆڕە پۆلیسییەکانیتر خەڵکیان خستۆتە ژێر چاودێری ووردی خۆیان . فەساد و وێرانی و بێ بەزەیی و تاوان نرخی مرۆڤایەتییان کەم کردۆتەوە . مرۆڤ لە کۆتایی سەدەی بیستەم دا هەم لە جیهانی ڕۆژئاوا و هەم لە وولاتە کۆمۆنیستییەکان بەدوای ڕێگایەکدا دەگەڕێ کە لە ژێر دەستی و کۆیلەتی ڕزگاری بێت.

بارودۆخی (پۆلۆنیا) و هەڵچوونی کارگەران لە وولاتێکدا کە لافی حکومەتی کارگەری لێدەدا نموونەیەکی بەرچاوی تێکۆشانی خەڵکە بۆ نەجات بوونیان لەژێر ستەمی کۆمۆنیزمدا لە وولاتە سەرمایەدارەکانیش نموونەی بەرچاوتر هەن . ئەوەی ئاشکرایە ئەوەیە بۆ ڕۆژئاواییەکان کۆمۆنیزم تراویلکەیەکی (سراب) بلاوە کە هەرچی لێی نزیک دەبنەوە کەم ڕەنگتر دەبێت . وە بۆ خەڵکی ژێر دەسەڵات و ستەمی ولاتە کۆمۆنیستییەکانیش ڕۆژئاوای سەرمایەداری هەمان سیفاتی هەیە . ئەوەی بەڵگە نەویست و دیارە هۆکار و ڕەفتارەکان لە هەردوو کۆمەڵگای کۆمۆنیستی و سەرمایەداری جیاوازن لە یەکتری و

هێشتا مرۆڤی نیشتەجێی هەردوو کۆمەڵگاکە کەوتونەتە ژێر دوو جۆری جیاوازی ستەمەوە . لە کۆمەڵگای کۆمۆنیستی خەڵک لە قەدەغەکردنی دین و مەزهەب ناڕەحەت و غەمبارن و لە کۆمەڵگای سەرمایەداریش دایە تا سوودی سیاسی پێ وەربگرن ئازار دەچێژن.

ئێستاش کاتی ئەوە هاتووە کە ڕاستگۆییانە پێتان بڵێم کە بۆچی بوومە دوژمنی ڕووسیا؟ هۆی هەرە سەرەکی بریتی بوو لە بۆچوونە سیاسی و مرۆڤایەتییەکانی من لەسەر پایە و بنەمای ئایدۆلۆژی ڕژێمی ڕووسیا لاواز ببوو . نەمدەتوانی لەگەڵ سیستەم و کاری توندوتیژی و نامرۆڤایەتییەکانی ڕژێم لەگەڵ ڕاکێشانە دادگای هەر کەسێک کە بچووکترین ناڕازی بوونی لە ڕژێم دەربڕیبایە لەگەڵ نەبوونی ئازادی فەردی و شێوە دیموکراتیەکان لەگەڵ بەکارهێنانی کارگەران بۆ سوود و قازانجی خاوەن پلە و پایە بەرزەکان لەگەڵ ئەو بارودۆخە ئایدۆلۆژییەی کە خەڵکی ڕووسیای بەتەواوی بەرەو گومڕایی دەبرد و لەگەڵ بێدادی و زۆر لە نایەکسانی تری باو لە ڕووسیادا خۆم بگونجێنم. لە پشت پەردەی ئەم وەڵامە کورتەدا ساڵانێکی زۆری بیرکردنەوە و دوو دڵی هەیە. هەروەک پێشتر گوتم ئەم گومان و دوو دڵی و بیرکردنەوەیە لە کاتێکدا دەستی پێکرد کە من لە زانکۆ لە کۆلێژی ئەفسەری بووم. واتە کاتێک کە یەکەمین بۆچوونی من لەسەر ڕوواڵەتی نەفی کۆمەڵگای ڕووسی بڕوای منی لەسەر کۆمۆنیزم لاواز و لەق کرد.

کۆتایی

## وەرگێڕ لە چەند دێڕێکدا :

ناو : عەبدولڕەحمان عەلی محەمەد، خۆی بە (مەهەندیس عەبدولڕەحمان) و باوکیشی بە ( عەلی کوردە) ناسراون.

لە ساڵی ١٩٦٠ لە شارەدێی (حاجی ئۆمەران) سەر بە پارێزگای هەولێر لە کورستانی عێراق لە دایک بووە.

خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندی بە چەندین قۆناغ لە عێراق و ئێران دا بڕیوە.

لە ساڵی ١٩٨٥ بڕوانامەی بە کالۆریۆس لە ئەندازیاری بە پلەی (باش) لە زانکۆی موسڵ وەرگرتووە.

پێشمەرگە و کادرێکی پارتی دیموکراتی کوردستانە.

پلەی ڕاوێژکاری هەبووە لە دیوانی سەرۆکایەتی ئەنجوومەنی وەزیران.

نەقیبی ئەندازیارانی کوردستانە و ئەندامە لە ئەنجوومەنی نیشتمانی عێراق.

- ئەمەیان دووەم بەرهەمی لە چاپ دراویەتی . بەرهەمێکی تریشی ئامادەیە بۆ چاپ و یەکێکی تریشی لە ژێر ناوی (کورد و کوردستان) لە نووسینی (دێرک کینان) لەژێر دەستدایە.